# یادداشتەکانی میجەر نوئێل لە کوردستان






وەرگێرانی
حسین احمد جاف
حسین عثمان نێرکسە جاری

# یادداشتەکانی مێجەر نۆئێل لە کوردستان



وەرگێڕانی
حسین احمد جاف
حسین عثمان نێرگسەجاڕی

ئەم کتێبە بە :

مام حوزنی و ئەمین زەکی و ئەوانەی کە مێژووی کوردیان نووسیوە و ئەوانەی کە مێژوو بۆ ئێمە دروست ئەکەن ...

پێشکەش بێت

وەرگێڕەکان



ح . نێرگسە جاڕی



ح . جاف

# پێشـــەکی

مەبەستی تایبەتی ئەو کارەی نۆتێل‌و سروشتی ئەنجامدانی هەرچی‌یەك بوو‌بێت‌و تـا چ ڕادەیەك کۆمەڵـەکەی مێجەر نۆتێل لـە کاردکـەیاندا سـەرکەوتوو بووبن ئـەم کتێبە [ یادداشتە ڕۆژانەکانی مێجەر نۆێل لـە نیشـە تایبەتیەکەی کوردستانیا ] یەکێکـە لـە گـرنگتریـن بـەڵگـە ئینگلیزی‌یەکان لـە بـارەی ناوچەکـەوە •

ناوچەکە لـە دێرزەمانەوە ، گەلێ هێزو دەسەڵاتی هـەمەجۆر وەك ڕۆم‌و تورك‌و عەجەم تەماعیان تێکردووەو مرخیان لە سامان‌و خاك‌و نـاوی خۆشکردووە هەتا ئێستەیش ئەو دەم تێژندنە هەر بەردەوامە ، ئەم کتێبەش وەك بـەڵگەو دەقێك ئەڵقەیەکی بچووکە لـە زنجیرەیەکی دوورو درێژی ئـەو ڕاپۆرتانە کە ئیستخباراتی بەریتانی لـە بارەی ناوچەی کوردستانەوە بە تایبەتی ـ وە لـە بارەی ناوچەکانی «وان»و بەرزاییەکانی دیجلـــەوە بـەگشتی ئامادەی کردبوون •

ئـەم ڕاپۆرتەی ئێمەیش قەترە بـە دەریـایـەو خۆشبەختانە بـۆی ڕەخسـاوە کە ڕووناکی بدۆزێتەوە ، ئەم ڕاپۆرتە گەلێ شت دەخاتە ڕوو، بۆمانی والا دەکاتەوە کە لە دووای جەنگی جیهانی یەکەم موخابەراتـی بەریتانی چ ڕۆلێکی گرنگ‌و کارێگەری بووە لـە ڕەنگ ڕشتنی ناوچەکەو درووست‌کردنی قەوارەو کیانە تازەکانیا !! پێویستە ئەوەیش لەیاد نەکەین کە دائیرەکانی مخابەراتی لە مێژەوە زەمینەیەکی باشیان خۆش کـردووە بۆ کارگێڕو ئەفسەرە سیاسی‌یەکـانی خۆیـان ، وە پوختەیـەکی بـاری

ناوچەکانی عیراق بەگشتیو ناوچەکانی کوردستان بە تایبەتی ، کراون بە کاکڵەیەكو خراونەتە بەردەم ئەو کارگێرو ئەفسەرانە ، بەمەیشەوە نەوەستاونو پەلیان بۆ ناوچەکانی دیکەی کوردستان کوتاوە لە تورکیاو سوریاو ئێراندا •

بنەماو ژێرکاسەی ئەم ڕاپۆرتەش هەرچییەك بوبێت ، بەڵام خۆی نزیکە لە ڕاستییەوە ، بگرە گەلێ شتیشی پڕ بەبڕ پێکاوە ، ئەو ڕووە ئاڵۆزو • گرێ ئاژنەی • کێشەی کوردی لەو کاتەدا خستۆتە بەردەستی خوێنەوارن • وە بە شێوەیەکی تێرو تەسەل باسی خێڵو پەلە ووردەکانی سەرەك خێڵو پیاوە گەورەکانی کورد دەکا ، ڕووناکی دەخاتە سەرباری ئابووریو ژیانی ڕۆژانەیان ، ژمارەی چەکدارو توانستی شەڕو شەر کردنیان • لەهجەی کوردەکانی ئەو ناوچانە • جگە لەوانەیش ، گولێژێرێکی فولکلۆری کوردیمان دەخاتە بەردەست کە سامانێکی زۆر بەنرخە، هەروەها بڕوانامەیەکی پتەوو متمانەدارمان ئەداتێ کە قزلباشەکان تانوپۆ کوردنو بگرە زۆریش بەخ «فخر» دەکەن کە کوردنو بەکوردی ئەدوێنو گۆرانی ئەڵێنو جلوبەرگی کوردی دەپۆشن ، بەم شێوەیە بۆچوونی گەلێ لە ڕۆژهەلاتناسە بێگانەکانی ڕەتکردۆتەوە کە بەلایانەوە ئەو قزلباشانە کورد نین •

نە مێجەر نۆیل دۆستێکی زۆر دڵسۆزی کورد بووە ، وە نە کوردیش ئەوەندە بە دەسەڵاتو سامداربووە هەتا نۆیل خونکییان بۆ بکات • بەڵام نۆیل لە گەشتەکانی ناو کوردستانیا ئەوەندە دیاردەو ڕاستییەکانی ناو کوردەواری زەقو بێ خەوش بوون •

نۆیلیشیان ڕاپێچ کردووە ــ هەرچەند تا رادەیەکیش بووە ــ کە ڕاستگۆ بێ لەگەڵ خۆیو خەڵکی ترا !!

ئـەم کتێبـە هـەرچەندە بێخـەوشیش نیـە ـ شـــایەتێکە ...
شایەتێکی ، وەسائقی ، زرتو زیندووە لەســەر ئەوەی کـە گـەلی کورد
خاوەنی نەریتو ڕەوشتی بـەرزو ڕەسەنی خۆیەتی ، باسی ئەوە دەکات
کـە مەسەلەی ڕەوای کورد تووشی چ چەواشەو تەمو مژێکی جیهانــی
کرابوو ، حیزبی « ئیتحادو تورەقی » چ دەورێکی ناحەزو دوژمنانەیـان
بەرامبەر جوڵانەی ئازادیخوازی نەتەوەی کورد هەبووە ، تاقمەکانــی
کەمالی‌و ئیتحادی‌یەکان وە نەبێت هەر مافی کوردو نەتەوەکانی تریــان
پێشێل کردبێت ، بەڵکو ئینکاری‌یان لە بوونیشیان دەکرد ، بەڕاستو چەپا
کەوتبوونە ویزەی گەلی کورد ، سیاسەتی دابڵۆسین‌و بـە تورك کـردن‌و
ئاوارەکردنی کوردەکان ڕوویەکی چەپەڵو قێزەوونی عوسمانی‌یەکـان
بوو .. ئـەم کتێبە ڕووناکی دەخاتـە سـەر لـە دایك‌بوونـی کۆمـەڵـە
سیاسی‌یەکانی کورد لـە ئەستەموول ، ناوی ئەندامانی پلـە بەرزی ئـەو
کۆمەڵانەیش لەیاد نەکات ، وە بە شێوەیەکی دوورو درێژ باسی بنەماڵەی
تێکۆشەری بەدرخانی‌یەکان دەکات ، ئەو خێزانـەی لـە پێنـاوی مەسـەلە
ڕەواکەی گەلی کوردا چ سزایەکیان چێشـتووەو چـەند قوربانــی‌یـان
پێشـکەش کـردووە .

تێبینی‌یەك هەیە پێویسـتە لـە هیچ کەسێ نەشـارێتـەوە کە ئێمەی
وەرگێر وە بـەتـایبـەتی وەرگێـڕ ئینگلزی‌یەکە پڕ بەپڕی دەقـەکانمان
وەگێڕاوە ، وە لـە هەر شـوێنێکدا دەسکاری‌مـان کردبێت پـەنجەمـان
بـۆ ڕاکێشاوە ، گەلێ پەراوێزیشمان کردووە بە پاشکۆی کتێبەکە ، بـۆ
ئـەوەی خوێنەری ئازیز ، لە هەموو ئەو شتانەی کە نۆیل باسی کردوون
ئاگادارو هوشیار بێت ، ئەوەی شیاوی باسـە دەقە ئینگلیزی‌یەکـەی وەك

سلق ڕووته ، بەبێ هیچ پەراوێزو ڕوونکردنەوە یەك گەیشتۆتە دەست تیمە .

هیوادارین کە خوێنەری ئازیز ، لە کەمو کورتی‌مان بە تایبەتی کەم کوڕی‌یەك کە بە توێکڵو بایەخ داربێت نەبورن‌و بە گیانێکی دڵسۆزانەو خاوێنەوە ئاگادارمان بکەنەوە ، دڵنیاین کە دڵسۆزانی تری گەلی کورد لە داهاتوودا ، دەکەونە پەیجۆرو پشکنین ، ڕاو بۆچوون‌و چەندین شایەتی تری وەك نۆیل ئەدۆزنەوەو دەیخەنە بەردەم نەوەکانی دووارۆژوو ڕای نشی جیهان کە گەلی کوردیش گەلێکە وەك گەلانی تری ئەم جیهانە ..

ح . جاف
ح . نێرکسەجاڕی

# مێجەر نۆیل کێیە؟

مێجەر نۆیل ـ ی ئینگلیزی ئەفسەرێکی چالاکو هێمنو شارەزا بوو، فارسی بە باشی دەزانی ، بردبوو بـە باری دەروونی گەلەکانی ڕۆژهەڵات وسەر خێڵەکانی ، لـە سەرەتاوە نۆیل لـەنـاو خێڵـی «بـەختیاری»(۱) یەکاندا کـاری دەکرد .

نۆیل زیرەکانە توانی ئـەو خێڵە گـەورەو چـەلەنگە ، بکات بـە دوژمنی ئەڵمانەکان ، وە ئەم دابڕینـەش خـزمەتێکی باڵای شـەریکەی نـەوتی ئێرانی کرد ، کە دەزگایەکی ئینگلیزەکان بوو لـە ئێراندا .

لـە ساڵـەکانی دووای جەنگی جیهانی یەکەمدا ، نۆیل توانی بچێتە ناو کۆمەڵـگای کوردەوەو پەیوەنـدی‌یـەکی پتـەو لـەگەڵ سـەرخێڵو کاربەدەستانی کوردستاندا ببەستێت ، کوردی‌یەکی پوخت فێر بـوو بو . خوالێخۆشبوو مامۆستا تۆفیق وەهبی باسی کردووە کـە خۆی وانـــەی تایبەتی زمانی کوردی بـە نۆیل وتووە ، هەرچەند ئیش‌کردنی نۆیل لـە

ناو کوردەکانا ، چەند ساڵێکی کەمی خایاندووە ، بـەلام لـەو ماوە کورتەدا هەستو سۆزی گەلێ لـە پیاوە ناودارەکانی کوردی ڕاکێشاوە ، بـە ڕادەیـەك یەکی نـە کەڵـە ڕۆشنبیرانی کوردی ئـەو سـەردەمە وەك مامۆستا ڕەفیق حیلمی گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە ، ئەگەر ئیشو کـار لـەو کاتەدا بە دڵی مێجەر نۆیل بچەرخایە ، گەلی کورد بە گەلێ لـە ئامانجو هیواکانی خۆی شاد دەبوو ، بەلام نۆیل لـە پاش ماوەیەکی کەم ، لـــە کوردستانا دوور خرایەوەو ئینگلیزەکان بـە قسەی خۆیان بـە ئیشـێکی

تایبەتی ناردیان بۆ ناوچەی قەفقاس لە کاتی گەڕانەوەی‌دا لە ڕەشت کە دەکەوێتە سەر دەریای قەزوین ـ شۆڕشگێڕە «جەنگەلی» یەکان دیلی دەکەن ، لە سەرەتاوە گەلێ سزاو ئەشکەنجەیان دا ، پێنج مانگی ڕەبەق لای ئەوان بەند کرا ، لە دووای تێشکانی شۆڕشگێڕە «جەنگەلی»یەکان و مۆرکردنی پەیمانی ئاشتەوایی لە گەڵیان ، نۆیل ـ یش ئازاد کرا ، لە کاتێکا لە بەندیخانە بوو گەلێ پیلانی بۆ ڕاکردن ئەنجام دا لە هیچ کامیاندا سەرکەوتوو نەبوو ، هەموو جارێکیش سزاو ئازاری زۆرتر دەبوو ، کە لە بەندیخانە رزگاری بوو ، گەڕایەوە بۆ بەغداو لە جاران تینووتر بوو بۆ سەرکەشی و سەرە ڕۆیی ـ مغامرات ـ وەك ئەفسەرێکی سیاسی ناردیان بۆ کەرکووك لە سەرەتای شۆڕشی شێخ مەحموودی بەرزنجی کە دژ بە ئینگلیزەکان ، نیررا بۆ سلیمانی[٢] .

نۆیل پێش ئەوەی لە ئێرانا کاری سیاسی گرێتە دەس ملازم بووە لە بەتابوونی‌ی پیادەی جل‌و چواری ـ ی « میوواوا » داو لە سوپای هیندوستان ئیشی دەکرد لە پاشا بووە بە جێنشین «موقیم»ی سیاسی لە «بوشێری» ئێران .

لە بەهاری ١٩١٥دا نۆیل ـ وەك ئەدمۆنس دەڵێ ـ تووانی داستانێکی مێژوویی بۆ خۆی بنووسێت ، تووانی بەناوبانگترین خوفیەو جاسوسی ئەڵمانی « ڤاسمۆس ١٨٨٠ـ١٩٣١ » بە دەستی خۆی دەستگیر بکات ، ئەڵمانی‌یەکان «ڤاسمۆس»یان نارد بووە بەندەری بچووکی « دیلام » کەوتۆتە لای سەرووی بوشیر بە نیازی ئاژاوەنانەوە ، بەڵام خوفیەی ئەڵمانی تووانی لە چنگ پاسەوانە ئێرانی‌یەکەی دەرباز بێت ، لە ڕۆژی دووایی‌دا نۆیل خەریك‌بو بکەوێتە هەمان بۆسەوەو لە لایەن ئەو خێڵانەی کە (ڤاسمۆس) لە خشتەی بردبوون دەسگیر بکرێت ، وە

زۆر بە ستەم لەو بۆسەیە خۆی رزگار کرد •

سەرچاوە «ئەرشیفی»یەکانی بەریتانی دەڵێن :ـ نۆیل «ئەکادیمی»یەی سەربازی لە ئینگلترە تەواو کردووە • لە دائیرە سیاسی یەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا لە هیندوستان ئیشی کردووە تکایە بڕوانەرە ئەم سەرچاوەیە :ـ

Decuments on British Foreign Policy
Vol. IV P. P. 693, 742.

مامۆستا «رفیق حیلمی ـ یش» لە بەشی یەکەمی [یادداشتەکان]ی دا، گەلێ جار ئەم باسەی کردووەو هاوچەرخی نۆیل ـ یش بووە ، ماوەیەکیش لەگەڵیا ئیشی کردووە ، هیوادارین ئەم کتێبەمان ـ یادداشتە رۆژانەکانی مێجور نۆئێل ـ ئەو باسانە باشتر والآ بکاتەوە • د • کەمال مەزهەر لە کتێبی ـ کوردستان لە ساڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەما ـ باسی ئەوە دەکات کە نۆیل چۆتە هەر شوێنێك ئەوەی دووپات کردۆتەوە ، کە حوکومەتی بەریتانیا بەرامبەر کوردەکان نیازی پاكو خاوێنە ، وە راپۆرتی تێرو چڕی لە بارەی کوردەکانو پەیوەندی یان لە گەڵ ئەرمەنی یەکانداو گەلێ بابەتی تری دەنارد بۆ حوکومەتەکەی لە لەندەن، هەوڵی ئەوەی ئەدا • کە وێنەیەکی روونو بێ لەکەی باری کوردستانی ئەو رۆژە ، خواستو ئاواتەکانی دانیشتوانی بخاتە ڕوو • لە راپۆرتەکانیا لایەنی کوردەکانی گرتووە • بە گەرمی یەوە پشتگیری کردووە لە مەسەلەی ڕەوای کورد هۆی ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ :ـ

١ ـ زۆر خۆشنود بووە بە سیفاتو نەریتی گەلی کوردەوە •

٢ ـ یالەبەر ئەوەی کە ئەویش ئارەزووی لەوە بووە بێتە «لۆرانس»ی(٣) کوردان ، یاخۆ لەبەر هەردوو هۆکە بووە • کەمالی یەکان ، لە هەڵسو کەوتی نۆیل کەوتبوونە گومانەوە ، بۆیە مستەفا کەمال لە گەڵ لێپرسراوەکانی دیکە ئەو هەڵسوکەوتەیان خستە ژێر توێژینەوە •

د . کەمال مەزهەر لەسەر ئەم ئەڕواو دەڵێ :ـ

خۆم پرسیم کرد لە خوالێخۆشبوو ئەکرەم[٤] بەگی جەمیل پاشازادەی دیاربەکری ، کە ئایا نۆیل لەو سەردانەیدا هەوڵی ئەوەی داوە خەڵک لە خشتەبەرێ و دەسەمۆیان بکات ، یاخۆ هیچ پارەو پووڵێکی بڵاوکردۆتەوە بۆ ئەو مەبەستە ؟؟ .

ئەکرەم بەگیش وەڵامی دامەوە کە سووسەی شتی وای نەکردووە ، بەڵکو نۆیل خۆی داناوە بە میوانی « کۆمەڵی کوردی » کە ئەکرەم بەگیش یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە .

سەردانی نۆیل بۆ کوردستانی زووروو دڵی کەمالییەکانی لە ئینگلیزەکان کرمێ کردبوو بۆیەکا، هەر ئینگلیزەکان خۆیان بۆ پینەکردنی ئەو کرمێبوونە بڵاویان دەکردەوە کە ڕۆیشتن و یا خۆ ڕاسپاردەی نۆیل هیچ بایەخ و گرنگی‌یەکی نی‌یە ، بە رادەیەك عەقید « ب . بیل »ی ئەفسەری سیاسی ئینگلیزەکان لە حەڵەب ، کاتی سەریدا لە پیاو ماقوڵ و دەسەڵاتدارە مەدەنی‌یەکانی خەربوت و ملاتیاو دیاربەکر ، هەر لەو کاتەیشدا نۆیل سەرگەرمی ئەنجامدانی ئیشەکەی بوو پێی ڕاگەیاندن ، کە حوکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی ئاگای لە هەڵسوکەوتی نۆیل نیەو ڕازیش نی‌یە کە هیچ ئەفسەرێکی ئینگلیزی پڕو پاگەندە بڵاو بکاتەوە « هەمان سەرچاوەی پێشو کە ئەویش لە کتێبی ـ مستەفا ئەتاتورکەوە لاپەڕە /١٣٦وە وەری گرتووە » .

مێژوونووس د . کەمال مەزهەر لەسەر ئەم باسە ئەڕواو دەڵێ :ـ ئەم : « بانگەشەی ، میستر (بیل)ە دەری ئەخا کە سیاسەتی بەریتانیا ، بەرامبەر مەسەلەی کورد ، سیاسەتێکی چەند لایەنەی مەیو بووە ئەچێتە زەین کێوە کە نۆیل ـ ێك :ـ لە سیاسەت و دڵسۆزی بۆ ئیشوکاریدا ، بە بین دریژ لە هەڵسو ـ کەوتیا بە ناوبانگ و شۆرەتی بووبێت ، پیاوێکی

وەهـا ئیشێکی ئەوەندە گرنگی پێ بسپێرن ، بەڵام بـۆ ئەنجامدانی ئـەو ئیشـە بـە رەسمی داوایان لـێ نەکردبێت !!

لە کاتێکا کۆمەڵێ سەربازی ئینگلیزی لەگەڵ «نۆئیل»دا نێررابوون !!
مامۆستا رەفیق حیلمی ، لە بەشی /٢ی یادداشتەکانیا باسی نۆیل دەکـاو دەڵێ :ـ [ لـە جزمی یەکەما وتمان کە نۆیل لەگەڵ ئەحمەد فایق ـ ی خەڵکی سولەیمانی چوو بۆ کوردستانی تورکیا ، بۆ ئەوەی گەورەکانی کوردو نیشتمان پەروەرەکانی ببینێ • بەڵام بزووتنەوەی مسـتەفا کەماڵ لـەو رۆژانەدا بۆ بەرهەڵست لەم کارە ، هێزەکانی کەوتنە ڕاونانی نۆیل‌و ئەحمەد فایق ، وە بـە یارمەتی هەندێ سەرۆك عەشرەتی کورد خۆیـان دەربـاز کرد ] بەڵام ئەم باسە بەڕای ئێمە ، یـا لە سەردانی یەکەمیدا بۆ ناوچەی دیار بەکر بووە یاخۆ سەردانێکی تری بـە نهێنی بـۆ ئەو ناوچەیە کردووە ئەمەیان لە ڕاستی‌یەوە نزیکترە ، چونکە لە سەردانی دووهەمـا هیچ بۆنێکی ئەوەی لێ نایەت ، لە هەمان کاتیشدا ئەندامەکانی کۆمـەڵەی نۆیل ناویان براوە ـ چ لەسەرەتای ڕاپۆرتەکەدا ، وە چ لە بروسکەیەکی نۆیل کـە نـاردوویـە بـۆ ئـەمین داری گشـتی / لاپـەرە (٩٢) •
امۆستا رەفیق حیلمی لە هەمان بەشی دووهەمدا دەڵـێ :

لـە هەندێ سەرچاوەی تـرەوە بیسـتوویە ، نۆیل بۆیـەکا چۆتـە کوردستانی تورکیا تـا کوردەکانی ئەوێ دڵنیا بکات کە هەموو مافەکانیان لـە « کۆنگرەی ئاشتی »یا دابین دەکرێن ، نابێت بە هیچ جۆرێ ئاڵۆزی‌و ئاژاوە بنێنەوە ، وە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بە ڕێزەوە تەماشای گەلی کورد دەکـەن •

ح • جـاف
ح • عثمان نێرگسەجاری

یادداشته‌کانم[٥] به‌و ڕاپۆرته کۆتایی هات که له ١٤/٤ حوزه‌یرانی ١٩١٩/دا لـه باره‌ی سه‌ردانی ناوچه‌ی دیاربه‌کره‌وه نووسی بووم ٠

لـه دیاربه‌کره‌وه به‌ره‌و حه‌له‌ب که‌وتمه ڕێو له‌وێش چـاووم بـه کۆلۆنێل ویلسن که‌وت ، ئه‌وه‌ی شیاوی باسه هـه‌مان کۆلۆنێل له ٢٦ی حوزه‌یرانیش‌دا به فڕۆکه بۆ حه‌له‌ب هاته‌وه ٠

ویلسن[٦] لـه ١٣ی حـوزه‌یـران‌دا پێشـــنیاری کـردبوو کـه کوردستانێکی سه‌ربه‌خۆ لـه تورکیا درووست بکرێ به‌ڵام له‌ژێر ڕکێفی ئێمه‌دا بێ‌و « ئینگلیزه‌کان ـ وه‌رگێڕه‌ران » ٠ له ده‌ورو به‌ری ئه‌م ناوچانه درووست بکرێت :ـ وان ، تبلیس ، دیاربه‌کر ، معمورة العزیز ، له پاش هه‌ندی پرسو ڕا ، بریار درا که بڕۆم ئه‌سته‌مروڵو له گه‌ڵ بنه‌ماڵـــه‌ی به‌درخانی‌یه‌کاندا په‌یوه‌ندی بکه‌م ، به‌و نیازه‌ی له گه‌ڵ یه‌کێ یا چه‌نـــد که‌سێکی ئه‌و بنه‌ماڵه‌یه‌دا وه‌ك کۆمه‌ڵێکی تایبه‌تی بچینه کوردســتان ، بـۆ پوچه‌ڵ کردنی پڕوپاگه‌نده‌ی به تینی تورکه‌کان که ده‌یان‌ویست گیـانی ئیســـلامه‌تی‌و[٧] خه‌لافه‌ت نشین بکه‌نه‌وه بـه بـه‌ری ئیمپراتۆریه‌تـه نه‌خۆشه‌که‌یاندا ، که له گیانـه‌لادا بـوو ، بۆ ئـه‌و مـه‌به‌سته‌یان ، هانـی کورده‌کانیان ئه‌دا دژی ئێمه « ئینگلیزه‌کان ـ وه‌رگێر » ٠

کورده‌کانیان ده‌ترسان ، که گوایا ئینگلیزه‌کان ئه‌یانه‌وێت ده‌وڵه‌تێکی

ئەرمەنی ڕۆبنێن کوردەکانیش بخەنە ژێر ڕکێفی ئەو دەولـەتە تازەیەوە !!

کـە لـە ۳۰ی تـەموزا گەیشتمە ئەستەموول چاوم بە سەر کردەکانی کورد کەوت لـە پێش هەموویانەوە شێخ عبدالقادرو ئـەنـدامی بنـەماڵەی بەدرخـانیـیـەکان ، لـە پاش لێکـۆڵینەوەیەکی خـەست ، کوردەکان پێشنیاریان کرد ۔ کۆمەڵێك دروست بکرێت‌و بۆ سەردانی ناوچەکـە بخرێتە تەك من .

کۆمەڵەکە لەمانە پێك هێنرا : دوو کوڕی ئەمین عالی بەدرخان ، سید مینی زاوای شێخ عبدالقادر ، سید ئیبراهیم ناوێك کە یەکێك بوو لە پیاو ماقوولانی دەرسیم .

ئەندامانی ئەم « وەفدە » لە پیاو ماقوولانی پلەی دووهەمی کۆمـەڵ بوون ۔ هۆی نەهاتنی گەورە پیاوانی کورد لەگەڵ من دەگـەرێتەوە بـۆ ئەوەی :ــ یەکێکی وەك شێخ عبدالقادر بوو دەترسا کە لەوانەیە تورکەکان، بـە « خیانەتی عظمی » تاوانباری بکەن ، یاخۆ یەکێکی وەك سـەید ئەمین عالی بەدرخان :ــ بە هۆی ئەوەی کاتی خۆی لە ناوچەکەدا بە خێزانێکی ساماندارو دەوڵەمەند ۔ ناسرابوو ۔ ئێستەش لێکەوتەیەو هەزارە شـەرمی دەکرد بـە پەرپووتی‌و ڕەجاڵی رووبکاتەوە ناوچەی کوردسـتـان ، لـە راستیشدا من لەوە دڵگران نەبووم کە شێخ عبدالقادر[٨] لە گەڵ منـدا نەهات ، چونکە هەرچەند پیـاوێکی ڕووخۆش بوو ، بـەڵام کەللە ڕەق‌و رەشبین‌و ئاسۆ تاریك بوو ۔ بەکورتی مامەڵەکردن لەگـەڵ ئـەم جـۆرە پیاوانەو بۆ گەشتێکی وەها دورو درێژ شتێکی گەلێ گران‌و ستەمە ، بەڵام گەلێ ئارەزووم لـەوە بوو کە ئەمین عالی بەدرخان لەگەڵمان بهاتایە چونکە جگە لەوەی کە سادەو ڕووخۆش بوو پیاوێکی گران‌و سـەنگین بـوو ، بەراستی پیاوێکی وەها بە سام‌و هەیبەت ، داڕێژراوی بیرو هۆش شورەت‌و

سومە خاوێن ، هەموو مەرجو پێداویستێکی سەرکردایەتی کارای تیا ئەدرەوشایەوە ، لەو نموونە پیاوانە بوو کە بە ڕوونی لە زمانی سەرکردەی خێڵە کوردەکانی دەزانی ، بە خۆیا ڕادەبینی کە سامو شەخسیەتی خۆی بە سەریانا بسەپێنێتو کاریان تێ بکات ، کوڕەکانی ئەمین عالی گۆشتنو قەپۆلە بوون ، کەمتر دەربەستی ڕێکپۆشی خۆیان بوون ، لە ئەستەموولّ گەورە بووبوونو پێداویستی ژیانیان لە ڕۆژنامە نووسی وەدەست دەهێناە هەرچەند هاتنی ئەم دوو کوڕە سودێکی وەهای نەبوو ، بەلاّم چونکە هیچ گیانێکی دژایەتی بە تیمەیان « ئینگلیزەکان ــ وەرگێر » تیا بەدی نەدەکراە هێنامن لەگەڵ خۆم ، جگە لەمەش ، پایەو ڕێزی بنەماڵەی بەدرخانی یەکان ، لە هەموو ناوچەیەکی کوردستانا ئاشکراو دیارە ، لە ڕوویەکی دیکەشەوە ، پێویستە نی یە ئەو دووانە بە ئەندامی ئەم کۆمەڵەی تیمە دابنرێن ، چونکە بە جووتە ئەو بەڵێنەیان شکاند کە بریار بوو ئەنجامی بدەن ، وە بە کارێکی ترسناکو سەرکەشی یان دایە قەڵەم . لە پێش ناوزەد (تسمیة)کردنی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەدا ، چەند کەسێکی یانەی کوردی لە ئەستەموولّ ، چووبوونە لای فەرماندەی گشتی ئەو ناوچەیە ، بۆ ئەوەی خێزانو کەسوکاری ئەندامانی کۆمەڵە رزگابن لە کوشتو بڕی کاربەدەستە تورکەکان ، فەرماندەی گشتیش ، بە مانا پێی ڕاگەیاندبوون کە هەتا ئەو کاتەی ئەم کۆمەڵە ، لە چوار چێوەی ڕەنجدانا بێت ، بۆ هێمنی کردنەوەی خێڵەکانو ئاژاوەو دەردیسەری بۆ حوکومەتی تورکیا کپ بکاتەوە ، هەتا ئەو کاتە خێزانەکانیان تووشی هیچ چورتمو ئازارێك نابن بۆ پاراستنی ئەو خێزانانە ، هەموو دەستەلاّتو نفوزێکی خۆی دەخاتە گەڕ .

لە ٢٣ی تەموزدا بە فڕۆکە گەرامەوە بۆ حەلەب لەوێشەوە بۆ بەغداد ، دیسان لە نۆزدەی ئابدا گەرامەوە بۆ حەلەب لە هەمان ڕۆژیشدا

جووته برا جەلادەت بەدرخان‌و کامەران عەلی بەدرخان لە ئەستەموولەوە هاتبوونە حەلەب . لەبەر ئەوەی کە ئەو جووتە ئەندامەی کۆمەلەکەمان بران،ئەکرەم بەگی جەمیل پاشای دیاربەکری دەستیشان کرد،کە گەنجێکی ڕووخۆش و خوێن گەرم‌و خۆشمەشرەب بوو ، لە ناو کوردەکانیشدا شۆرەتێکی خاوێنی هەبوو ، لە بەلجیکا خوێندنی تەواو کردبوو ، بۆ یەکەم جار کە یەکترمان ناسی ، بە جل‌و بەرگی کوردی‌یەوە هاتە لام ، بە بێ پێچ‌و پەنا هەست‌و هیوای خۆی لە بارەی ئاواتی دووا ڕۆژی نەتەوەکەیەوە دەربڕی ، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئاوات‌و هیوای نەتەوەکەی داوایەکی ڕەوایەو بە هیوا بوو بەریتانیا وەك دەولەتێکی « ئینتداب » ئەتوانێت بەشداری‌یەکی کارا بکات لەم ئاقارەدا ، هەر لەبەر ئەم خۆشبینی‌یە بە دووا ڕۆژی نەتەوەکەی .

والی دیاربەکر لە بەندیخانەی توونەد کرد ، بەلام توانی لە بەندیخانە خۆی دەرباز بکاو حەلەب بکات بە پەناگەی خۆی ، لە کاتێکدا بەلای « تەرابلس »دا تێپەڕ ئەبێت ، وەرگێرێکی بێگان شێوەی دەکاتەوە بەوە تاوانباری دەکات کە گوایا دەستی لە کوشتاری ئەرمەندا[9] بووە . تۆزێکی مابوو لە حەلەب بخرێتە بەندیخانە بەلام خۆشبەختانە لای کاربەدەستانی حەلەب ناوی منی[10] بردبوو بەم هۆیەوە گرتنەکەیان خستبووە دوای گەڕانەوەی من .

لە کانوونی یەکەمی پارەوە ئەم سیاسەتە خراببووە گەڕ :ــ هەموو ئەرمەنی‌یەك دەیتوانی بەبێ هیچ بەلگەیەکی ڕەدا ، موسلمانێك بدات بە دەمەوە ، بە گوناهی بەشداری‌کردن لە کوشتاری ئەرمەنی‌یەکاندا بە گرتنی بدات ، ئەم سیاسەتە کارێکی دژواری هەبوو لە سەرتاسەری کوردستاندا ، وە بووە هۆی تێبەردانی ئاگری قین‌و ڕق لە ئێمە « ئینگلیزەکان ــ وەرگێر » .

ئەوەتا ئێستە دەها بازرگانو کاسبکار ئامەزرۆن بێن بۆ حەلەب ، بەڵام درۆو دەلەسەی بازرگانە ئەرمەنی یەکان کە گوایا موسڵمانەکان ئەگیرێنو دەخرێنە بەندیخانەی حەڵەبەوە ، بەم شێوەیە ئاواتیان نەدەهاتە دی ، بگرە بازرگانە ئەرمەنی یەکان دەنگو باسەکەیان گەورەتر دەکرد . بۆ ئەوەی خۆیان گەورەی بازاڕو بازرگانی بن ، بە ئارەزووی خۆیان ئەراتێنی تیا بکەنو موسڵمانەکانیش[11] قەدەغە بێت لێیان .

بە قەتاری بەیانیان ـ حەڵەب ـ مان بەجێ هێشتوو بەرەو « ئاقچی قوین » ، « ئێسگەیەکی (٥٤) کیلۆمەتریە لە باشوری ڕۆژهەلاتی حەڵەبو دەکەوێتەوە سەر هێڵی ئاسنین[12] بەغداد ، کەلوپەلو پێویستیەکانی خۆمان لە پێشەوە بە وولاخ نارد بۆ عینتاب کە ٢٥ میلێك لە ئێمەوە دورە ، هەر لە عینتاب ـ یش شەوێك ماینەوە ، دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کە بە لایانا تێ دەپەڕین هەمەچەشنە بوون لە کوردو تورکو عەرەب ، هەتا بەرەو باشووریش بهاتینایە ژمارەی عەرەب زۆرتر دەبوو ، یەکێ لە هۆی ئەو هەمە جۆری یە ، ئەوەیە کە دێهاتی ئەم ناوچەیە تێکرا هی خاوەن موڵکە گەورەکانی عینتاب ـ ئو دانیشتوانیشی لە ڕاستیدا مسکێنو نۆکەری ئەو دەرەبەگە ساماندارانەن ، تۆو وولاخی جووت کردنیان ئەدەنێو لە هەقی ئەم خزمەتەدا نیوەی بەرهەمی ساڵانەیان دەماشنەوە ، نیوەکەی تریش بریتیە لە هەقی کرێکار ، بەڵام ئەوەی خاوەن زەوی ئەیدات بە کرێکار گەلێك کەمترە لەوەی کە پێویستە لە بازاری ش کردنا بدرێت ئەم بارو دۆخی کارە هەلو مەرجێکی لە باری ڕەخساندبوو بۆ تەشەنەکردنی بیرو باوەری بۆلشفیکی لەناو ڕەنجدەراندا لەبەر ئەوەی ئەو خاوەن زەوییانە بە ڕادەیەك دەسەڵاتی خۆیان

سەپاندبوو بەسەر ئەو دێنشینو ساویلکانەدا یاردێك زەوی چ قوورەت بوو لـە چنکیان دەربهێنرێتو بدریت بـە یەکێ لەو جوتیارانە •

بـەو شێوەیە ، خاوەن موڵکەکان بە لێشاوی بە تینی ڕۆڵەکانی ئەو سێ نەتەوەیە ، کورد ، تورك ، عەرەب گەمارۆ درابوون لە پاش تۆزێـك ڕامان ، ئەم ووتووێژەم لە گەڵ (ڕەونەنی)یەکی تورکدا ئەنجامداو ئـەم پرسیارەم لـەبڕوویا فوت کردەوە :ـ

ـــ ئینگلیزەکان لێرە چی دەکەن ؟

ـــ ئیمەیش ئەمە گێژی کردووینو سەری لێ دەرناکەین ، لە سەرەتاوە وامان زانی کە بە هاواری ئەرمەنی‌یەکانەوە هاتوون ، بـەڵام عـەریزەو داخوازیەکانی ئەوانیش ، کـە بـە ئینگلیزەکـان درابوو لـەم سێ مانگی دوواییەدا تەسلیمی پارێزگاری تورکەکان کرانەوە !!

# [ ـ٢٢ـی ئاب لە عینتاب ـ ]

ئـەم پرسیارە بەزەقی لە ڕووماندا دەوەستێت :ـ

لـە ژێر پەناو دەسەڵاتی کێدا لە عینتاب ـ ەوە بەرەو کوردستان بکەوینە ڕێی ؛ خۆ برادەرە کوردەکانی هاوڕێم ، هیچ پەیوەندی یەکیان نی‌یە بـە تورکەکانەوە ، لەلایەکی تریشەوە پێویستە سێ ڕۆژ بـە پێ بکوتین ، هەتا گەینە ناوجەرگەی لادێ کـوردەکان جگە لـەمانـەش ئـەو ناوچـەیـە سنوورییانە ، لە ژێر ڕکێفی چەند کۆمەڵێکی ڕێگرو جەردە دان ، بـەڵام دەنگو باسی ئەوەیش هەیە کە زۆربەی ئەوَ کۆمەڵانە کوردنو لە ژێـر پەردەیەکی سیاسی‌دا ئیش دەکەن ، بۆیەکا ، ئەو تاڵانچر پـاوانە کـە دەیکەن ، زۆرتر لە سەر حیسابی تورکەکانەو دژ بـە کاربەدەســتانی

ئەوانە ، ئا لێرەدا نامەوێت بە شێوەیەکی ڕەها ـ مطلق ـ بڕوانمە مەسەلەکە .

کوردەکانی هاوڕێم ڕێگایەکی دیکەیان پێشنیار کرد :ـ
بازرگانێکی کوردی ئاشناو پیاو باش هەیە لە شاردا بە ناوی یەحیا ئەفەندییەوە ، ئەتوانی یەکێك لە دەستو پێوەندی ئەو تاقمانە بدۆزێتەوەو جەردەیەك بە پارە لە پێش خۆیەوە بنێرێت بۆ ئەوەی ڕۆیشتنەکەمان ئاسانتر بکات . ئەم ـ دزدەستەکەی حەسەن ناوە گەنجێکی زۆر قۆزە بەڵام خوێڕیو بەڕەڵایە ، یەحیا ئەفەندی ـ م کرد بە قەڵفانی قافلەکەمان شەویش خوا هەڵناگرێت ئامادەیی خۆی پیشانداو خۆی کۆکردەوە ، ئەمڕۆ سەرقافڵەچیمان حەسەنەو لە ۲۳ی ئابدا کات ژمێر سێی پێش نیوەڕۆ لە عینتاب ـ ەوە بەرەو مەرعەش کەوتینە ڕێ ، لە کاتژمێری (۷)ی ئێوارەدا قافڵەکەمان شەکەتی زیفی لێ سەندوو لای دایە لاڕێیەکی گشتیو چادرمان لێهەڵدا .

لە ڕێگادا ، منالە تورکێ ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕاینەوە ، کە چۆن باوکی ژنێکی ئەرمەنی هێناوەو لەپاش ماوەیەك ئیسلام بووە ، ئێستایش بە بەختیاریو ئاسوودەیی پێکەوە دەژین ، هەرکە وەرگێڕی ئەرمەنی « مەفرەزەی پێشەوەیان » لە ئاق‌صو ، بەم کەینو بەینەی زانی شێتگیر بوو ، هەوڵێکی زۆری دا کە ئەو ژنو مێردە لەیەك دابرێت ، بەڵام هەمووی پووچەڵ بوونەوە . لە پاش ماوەیەك ، هەمان وەرگێر لە گەڵ قەشەیەکی ئەرمەنیدا دەچنەوە بنکلیشەی ژنەکە ، ئەم جارەش بە شێوەیەکی پەتیو بێ پەردە ژنەکە نەیویستووە لە مێردە موسڵمانەکەی جیابێتەوە ، پڕ بەدەم لە ڕووی وەرگێرو قەشەدا وەستاوەتەوەو هاواری کردووە کە هەتا گیانی تەپڕ لە لەشیدا پل بدات

ڕێگە نادات کەس لـە مێردەکەی بکات تەنانـەت بۆ ئـەو مـەبـەستە بەرەنگاریی سوپای بەریتانیاو تورکیش دەکات !! هەڵویستی پتەوی ژنـە ئەرمەنی یەکە ، وای لە وەرگێڕی ئەرمەنی کرد لە رووی کۆمەڵەکەمـاندا وەرگەڕێ‌و بە توندی بەڕێنیت : تورك کێیە ؟! ئینگلیز کێیە ؟! تـەنهـا ئـەرمەنەو ئەرمەن ، لـە دووا ڕۆژێکی نزیکـدا دەبێتـە گـەورەی ئـەم وولاتـە !! بـەم شێوەی سەرەوە زانیمـان کـە چۆن مەترسی لـە هەموو لایەکەوە گەمارۆی داوین • چونکە لـە ئاسـیای بچـووكدا گیـرۆدەی دوژمنایەتی یەکی ترسناك بووین • هۆی ئـەم ئالۆزیو دوژمنایـەتی یەش ، ئـەوە بوو کـە ئەرمەنی یەکان ، زیرەکانە بڵاویان دەکردەوە ، کە پێویستە هەموو پەیمانو پـەیوەندی یەکی نێو دەوڵـەتان ، لـە سـەر ئـەم بناغەیە دابنرێت کە دەوڵەتێکی ئەرمەنی بنیـات بنرێت • وە بۆ هەمیشە پێویستـە (١٠) موسڵمان ژێـر دەستەی یەك ئەرمەنی بێت • ئەم بۆچوونە هـەڵـەیە - بۆ نەگبەتی - لـە دڵی موسڵمانەکانیش‌دا چەقی بوو ناهەقیشیان نەبوو ، چونکە ئێمەی ئینگلیز بە سەرەڕۆیی کەوتبوینە وێزەی موسڵمانەکـان بـە بـەرو بیانووی ئـەوەی بەشداریەیان لـە کوشتاری ئـەرمەنی‌دا کردووە • ئەرمەنی‌یەکان بـە یـارمـەتی کاسبو دەوڵـەمەندەکانیـان ، توانیـان مـەسـەلەکەیان لـە سەرتـاسەری وولاتدا بخەنە ڕوو ، وە بـە شێوەیەکی پۆختو سادە ، لـە بەردەم ڕای گشتی‌دا والای بکەنـەوە ڕای گشتی‌یش هەرگیز لـەمـە ئـاگـادار نـەبوو کە ئـەرمـەنی‌یەکانیش دەرفـەتـی پێشکەوتنی هێزەکانی ڕوسیان[١٢] بـە هەل زانی‌وە ، زۆر جانەوەرانەتر دەستیان دابووە هێرش بۆ سەر هاوسێ موسڵمانەکانیان ، بە شێوەیەك هەقی بـەرو دووایان لێ کردنەوەو بگرە زۆرتریش !! •

کـە ڕووداوەکان بەو شێوەی سەرەوە پوختـەکراو خرایـە ڕوو ،

دەگەینە ئەو ڕاستی‌یش « کە ئاسانترین‌و بێ‌ترس ترین سیاسەت بۆ پێشکەوتنی ئێمە ، تێلەدانی ئاگری تۆڵەسەندنە ، بڕواکردنە بە ئەرمەنی‌یەکان‌و بەسەرهاتەکانیان نەك لە ئاشت بوونەوەو کپ‌کردنەوەی ڕقی ئاینی‌و ڕەگەزی بەلام هەردوو لایان گوناهو خەتایان هەیە منیش(١٤) ئەم سیاسەتە بە ژیرانە دەزانم کە لاپەڕەیەکی سپی بکرێتەوە بۆ هەردولا ، دوژمنایەتی‌و ڕقی کۆنیش بخرێتە پشت گوێ .

## [ ٢٣ی ئاب ]

دوێنێ شەو شتێکی سەیرمان بەسەر هات ، هەندێ لە خەڵکی ڕێی « تاقوام »ی نزیك بارگاکەمان « حەسەنی ڕابەرو سەرقافڵەچی ئێمەیان شێوە کردەوە ، کە کوردێکی چەتەو جەردەیەو ( ئێمەیش کۆمەڵێکی کوردین ـ وەرگێڕان ـ ) لاقاوی کوردەکانیش لە بەردەمانەوە هاژەی دێتو زۆرە « بۆیە دوو پیاوی ئێمەو ئێسترەکەیان دایە بەر گوللە ، ئەم دوو پیاوە ڕۆیشتبون لە دێ‌کەی نزیکمانەوە کا بهێنن ، بەلام هێرشبەرەکان، وەك بەرزەکی بانبان پەڕی دەرچوون « دوای ئەو ڕووداوە لەگەڵ گردەکەی دراوسێمانـدا کەوتینە قسەو باس ، بە ڕەشانێکی پڕ لە خۆشەویست ، بانگیان لێ‌کردین کە ئایا کەسمان تورکی باش دەزانین ؟ پاش خۆشو چۆنی‌یەکی گەرمو گوڕ « بە شوتی‌و ترێیەکی باش ئاشتیان کردینەوە .

## [ ٢٤ـی ئاب ]

پێش ئەوەی ڕوو بکەینە باکووری ڕۆژ هەڵات ، کازیرێکی دیکە بە ناوچەی « مەرعەش جوسی »دا بەردەوام ڕێمان کرد ، لە دوای

گەشتێکی ٤ کاژێری گەرما لای‌داینە دێی « تەبلا » کە چواردە خێزانی کورد لـە عەشرەتی سینامیللی‌و عەتامیللی ، وە شەش خێزانی تورکیش هاومالـی یەکتر بوون . [ تەبلا دێیەکی چەپە لـە پێشەوەی دێهاتەکانـی کوردەواری‌دایە . ] کە گەیشتینە ئەوێ . زۆر بـە گەرمی پێشوازی‌مـان لێ کرا ، ئەوەی بۆ یەکەم جار سەرنجی ڕاکێشام ، ئـافرەتانی ئەو دێیە بوو ، چارشێوو عەبایان نەپۆشی بوو ، جگە لەمەش زۆر ئازاو سەربەست بوون ، ئـافرەتانی ئـەو گونـدەم بینی ، بـێ چـەندو چونو شـــەرمێ ، موناقەشەیان لەگەڵ پیاوەکانی لای خۆیانا دەکرد . لـە گەڵ ئێمەیشـــدا هاوبەشی قسەو باسیان دەکرد ، ڕاو باری سەرنجی خۆیـان بـە شێوەیەکی ئـازایانـەو لـە کـات‌و شـوێنی خۆیـدا دەرئـەبـڕی ئـەم دەبـڕیـن‌و پرسیارکردنەشیان . تـەنها لەبـەر ئـەوە بوو کە دەیان ویست شت بزانین‌و پـەس !!

لـە سەرەتاوە ئـارەزووم لەوە بوو تێبگەم کە باری ژیانی تورکەکان چ کارێکی کردۆتە سەر ئـەم شوێنە چەپەکە ؟

ئـەم گوفتوگۆیەی خوارەوە بۆمانی دەرئەخات ، ـ بەڕای من ـ کـە هەستی نەتەوایەتی کوردەکان چەند ڕیندووە !!

بـە هەندێك لـە خەڵکی گوندەکـەم ڕاگەیانـد خەڵکی ئـاوایـی کۆبکەنەوە بۆ ئـەوەی وێنەیەك بگرین .

ــــ تورکەکانیش بێن لـەگەڵمان ؟

ــــ نـەخێر ... بـە تەنهـا ئێوە .

ــــ ئێمەیش ئـارەزومان لەوە نی‌یە کە تورکەکان لـەگەڵمان دەربچن .
لـە دوای‌دا پرسیارم کرد ژمارەی منداڵبوون‌و زاووزێ چەندە ؟

چونکە بەڕاستی ، مناڵ کەمیی ، لە دێکەیاندا بەزەقی دەبینرێت ، هۆی ئەو کەمی یەش بەلای ئەوانەوە ئەمەیە :ـ

ـــ خێڵە ڕەوەندەکان ، لە چۆڵو دەشتو دەرا دەژین ، ئازادترنو باشتر دەتوانن ژنەکانیان بخەنە خێرو خۆشیو زاوو زێوە ، بەلاّم بوونی ئەو تورکە مەلعونانە لەم دێیەدا ، ئازادیو سەربەستی لێ زەوت کردووین !! منیش ئەوەم بۆ باس کردن کە ئازادی خێڵە ڕەوەندەکان ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خۆیان زۆر کەیفیان لەو ژیانەیە ، بە ئارەزووی خۆیان هەڵیان بژاردووە ، هەرچەندە ئەو شێوە ژیانەش ئاسان نیەو پڕە لە ئەرکو کوێرەوەری، ئەوانیش بەم شێوەیەی خوارەوە وەلاّمیان دامەوە :ـ

ـــ قسەکانت زۆر ڕاستن ... هەرچەندە گەڕانو سووڕانەوە بە شوێن ئاوو لەوەڕدا خاسیەتی باشەی زۆر هەیە ، بەلاّم ئەم تورکانە نەبوونایە ، ژیانی ڕەوەندیی یان نەدەکردو نیشتەجێ دەبوونو ئەمەیان لەلا خۆشتر دەبوو .

ـــ حوکومەتی تورکیاتان خۆش دەوێت ؟

پیرەمێردێك وەلاّمی دامەوە :ـ

ـــ بۆ ئێمە وەها باشە بڵێین خۆشمان دەوێت !!

ئەکرەم بەگ :ـ کوردەکانی دیاربکر هەرگیز ناترسنو چی لە دڵیاندا هەیە هەڵی دەڕێژن ، لە ناکاو گەنجێکی کوردی خەڵکی ئەم ناوچەیە کە لە تەنیشتمەوە وەستابوو ، قسەکەی بە ئەکرەم بەگ بڕیو بە توندی ووتی :ـ

ئێمەیش لە کوردەکانی دیاربکر کەمتر نین !!

ئەم خشتە مەرزمێرەی خوارەوە ـ لە دواڕۆژدا سوودی لێ ئەبینرێت ـ ئەوە دەرئەخات کە جەنگ چ کارێکی ناهەمواری کردۆتە سەر دێیەکی بچووکی لاڕێی وەک « تەبلا » ٠

| | پێش جەنگ | لە پاشن جەنگ |
|---|---|---|
| ژمارەی ماڵەکان | ٢٠ | ٢٠ |
| هێشو گاسنی جووت | ١٥ | ١٠ |
| بزنو مەڕ | ٣٥٠ | ٢٥ |

ڕێژەی سالآنەی ووشکەدان ١ بە (٦)٠
ئەوەی جوتێ گا تۆوی کردووە لەم ساڵدا ٢٠٠ کیلۆگەنمو ١٠٠ کیلۆ
ڕێژەی سالآنەی ووشکەدان ١ بە (٦)٠

لە سێبەری کەپرێکدا دانیشتبووم گوێم لێبوو پیرەژنێکی کورد بە ئاوازێکی « جەرگو دڵ تاوێن » شیعری ئەووتو وبێشکەی کچەزاکەی پێ ئەلاوان ، پیرەمێردێکی ڕیش سپی بە شۆخیو گاڵتەوە دیمەنەکەی زۆرتر بۆ ڕوون کردمەوە :ـ

ئەو دێڕە شیعرانە خۆی داینـاون ، منالەکەش کوڕی کچە گ ورەکەیەتی ، کە زۆر بە گەنجی مردووە ، ئەو گۆرانیەش پێی دەڵێن « لای لایە » یاخۆ « دەرگۆش » ٠

ئەوا لە خوارەوە دەقی ئەو کردنەخەوە « تنویمە » بە سۆزەتان بۆ دەنوسین کە پێی دەڵێن[١٥] :

« ستراناـ دەرگۆش »

| | |
|---|---|
| دەر گوشا می ژ دارە | بێشکەی دارینم |
| من دایە کەفی تیرە | لە نزیك ئاگرەوە داناوە |
| من چی بکەم وەی دەرگۆشێ | من چی بکەم لە بێشکەی |

دەرگۆشێکی بێ خێرە
لوری لوری دەرگۆشکی لوری
نانی دەکەم نانی نایە
ئەسیولە کەدی نایە
گری‌یا ئاشی نابە

من دەسا خوە دایە دەوری
جەلادا لە دلا دکا زۆری

رۆلەی نەگبەت‌و کلۆڵ
ڕای ئەژەنم‌و ڕای ئەژەنم
بۆ ئەوەی بنوێت ، بەڵام ئیتر
خەو لە چاوی تۆراوە
ئەو ساوایەی کە لە تەوێڵی
نوسراوە
بە هەتیوی بژی‌و کەس نەبێت
نازی بکێشێ‌و ئاگای لێ‌بێت ،
بەڵام هەرچەند بگری‌و
بکروزێتەوە ، من ئەی‌گرمە
کۆشی نازەوەو ئەی‌پارێزم
لە سام‌و ترسی ستەمکاران ،
کە تەنانەت دڵیشمان داخ
دەکەن .
ڕای ئەژەنم‌و ڕای ئەژەنم‌و
ڕای ئەژەنم

لەو کاتەدا ئەم دێ گوساخەمان[11] بەجێ دەهێشت ، لە سوچێکی دووری دێدا هەندێك کەلاوەو شوێنەواری کۆنیان پیشان‌دام ، وەك خەڵکی دێ ئەیان گێڕایەوە پاشماوەی قەلایەکی مێژووی کۆنە ، ابراهیم پاشا ناوێك بنیاتی نەوە .

لە ڕێگادا هەندێ خەڵکی ئەو دێهاتانەمان بینی لێ‌یان ڕاگەیاندین چەنەو ڕێگری کورد کە بە « تۆبەڵە » واتا نەل ناوی دەرکردووە ، زۆر لە ئێمەوە نزیکەو ڕێ‌وونی دەکات ، حەمەنمان لە پێش خۆمانەوە

نارد هەتا ڕێگەمان بۆ ڕچەشکێنی بکات ، بەڵام وادیارە تۆپەڵ بەم زووانە نایەتە ئەم ناوە ، وەك باسی دەکەن ژنەکەشی ، پیاو ئاسا سەرو قژی ڕێکخستووە ، تفەنگ و فیشەکدانی لەخۆی داوەو شان بەشانی مێردەکەی ئیش دەکات ، تاریکی داهات و لامان دایە دێی « نوفاجیللی » هەرکە گەیشتینە ئاوایی خاوەن دێ کە دەرەبەگێکی تورك بوو پێشوازیی لێ کردین ، ئەم دەربەگە پیاوێکی قەبەو تەپۆ بوو ، یەکەندەردوو تێی هەڵکرد بە گلەیی کردن لە حوکومەتی تورکیا کە دەولەتێکی پەرپەووت و بودەڵەیە ، ڕای وەهابو ئەگەر بێتو دەستەڵاتێکی ئینگلیز بێت لەو ناوچەیەدا ، ئەم گەلحۆیە ئەبێت بە کوڕی حیکایەت و پارەو پولێکی باش دەنێتە سەر یەك ، لە پاش تۆزێك هاتەوە دووان :ـ

ـــ لەم چەندانەی پێشوودا پارەیەکی باشم کردە قەبەڵی هەڵکەندنی بیرێکی پاراو ، بەبێ ئەوەی قرانێك لە حوکومەتی تورکیا وەربگرم ، ئەمەیشم کەوتۆتە بەر گوێ ئەگەر ئینگلیز دەست بگرێت بەسەر ئیشوکاری وڵاتا یارمەتی‌یەکی باشم ئەدات بۆ هەڵکەندنی بیرەکەم ، وە بە شێوەیەکی باشتر دەیخەمە کار .

ئەوەی شیاوی باسە خەڵکی ئەم ناوچانە بەگشتی لەو بیرو ڕایەدان ، کە بوونی دەستەڵاتێکی(١٧) ئینگلیزیی ئەوان دەخاتە خێرو خۆشی‌یەکی باشەوە ، بەرژەوەندی خودیان دەپارێزێت ، لەوەش گەیشتم کە خەڵکی ئەم ناوچانە بێ ئاگان ، کە جەنگ لە ئەورووپادا چ کارێکی خراپ و دژواری کردۆتە سەر باری ژیانی ئابووری ! دیسان ئەوەش بێ ئاگان کە ئەورووپا چۆن شەکەت و بریندار بووە ، وە بە چ جۆرێ کەوتۆتە هەڵپەی خۆشیمار کردن و ئاوەدان کردنەوە ، هەرچەند ئەم هەڵپەی ئەورووپایە بە سستی ئەنجام ئەدرێت ، ئەو خەڵکەی کە

دڵیـان بە ھاتنی ئینگلیز خۆشەو گوایـا موعجزەی نوێیان بۆ دێنێ ، گەلێ پەژگاون‌و پەنجەی پەشیمانی دەگەزن ، ئەم خشتەیەی خوارەوە بە ڕوونی دەری دەخات کە جەنگ چ کارێکی کردۆتە سەر ئەم دێ گچکەیە :ـ

| | لە پێش جەنگ | پاش جەنگ |
|---|---|---|
| ژمـارەی ماڵـەکان | ٨٨ | ٨٠ |
| ھێش‌و گـاسن | ٦٠ | ٣٥ |
| وڵاخی بـەرزە | ١٠٠ | ٢٠ |

حوکومەتی تورکیا ٣٥ پیـاوی ئـەم دێیەی خستۆتە ژێر چـەک‌و نـاردونی بۆ مەیدانی جەنگ ، بۆ ئـەوەی تەنھـا پـازدە پیـاویـان لــە جەنگدا لێ بگەڕێنەوە ، ڕێژەنی وشکەدان لـە ساڵێکی بـە پیتدا نۆ بـە یەکە ، بەڵام ئەم ساڵ پێنج بە یەکە ، جووتێ گای دێمە کێڵ ٦٠٠ کیلـۆ گەنم‌و جۆی کردووە ، واتـا بە ڕێژەی دوو بـە یەك .

## [ ٢٥ـی ئاب ]

لـە نیوەڕۆدا گەیشتینە ( بازاڕچیك ) کە قائمقام نشینەو ناوچەکەیش ھەمـان نـاوی ھەیە ، ئەم شارۆچکەیە یەکەم بەشی ئیدارییە کە تووشی ھاتووین ، ئەرمەنییەکان داوای ئەم ناوچەیە دەکەن‌و بە خەیاڵی خۆیـان بـە ئەرمینیای تـازەی دەزانـن[١٨] !! رووبـەری ئـەم ناوچەیە ١٥٠٠ میلی چوار گۆشە یەو ١٠٠ دێیەك دەبێت ، دانیشتوانی نزیکـەی ٢٥ـ٣٠ ھەزار کەسێکن .

ئـەرمەنییەکانی ئـەم نـاوچەیەش لـە پێش جەنگدا ٢٥ کەسێك دەبوون‌و چەند دوکانێکیان لە زارکی ( مدخل ) ئـەم قەزایەدا ھەیە ، ئیدی

۱۰۰ دێ پرش‌و بڵاوه‌كـه‌ی تـری نـاوچـه‌كه ، بۆ ده‌رمـانْ بگـه‌ڕێی ئه‌رمه‌نی‌یه‌كی تیا نی‌یه، ئیتر كه‌ی ڕه‌وای هه‌ق‌و ویژدانه ـ گریمان تۆزێك خـاوه‌ن ویژدانین ـ ئه‌م هه‌موو خه‌ڵـكه بخرێته ژێر ره‌حمه‌تی ده‌سته‌ڵاتی ئه‌رمه‌نی‌یه‌وه ، بـاوه‌كو ئـه‌و ده‌وڵـه‌ته‌ش خاوێن‌و جاڕپـاكیش بێت ؟!!

لـه ئه‌نجامی پشكنین‌و پرسیار كردنم لـه نـاوچه‌ی دیـاربه‌كـــردا بـه‌بێ پـه‌رده‌و پێچو پـه‌نـا بڵاوم كردۆته‌وه كه نـابێت به هیچ شێوه‌یه‌ك ڕه‌گه‌زی كورد بخرێنـه ژێر ڕكێفی ئه‌رمه‌نی‌یه‌وه ، ئه‌وانه‌ی من ئـه‌نـاسن لـه نـاوچه‌كه‌دا بـاش لـه یادیـانـه كـه چیم وتووه !!

ئـه‌وڕاو پێشنیاره‌م كارێكی ئـاسـووده به‌خشی كرده سـه‌ر بـاری ئالۆزی نـاوچه‌كه ، له پـاش ماوه‌یه‌ك درا به گوێما كه تاكه دابینی كردن‌و زه‌مانێك بدرێت به كورد ئه‌وه‌یه كه هیچ نـاوچه‌یه‌كی كورد نـابێت بخرێته ژێـر ده‌سه‌ڵاتی بێ‌سنووری حوكومه‌تێكی ئه‌رمه‌نی‌یه‌وه ، ئایا ده‌زانن چه‌ند گرنگه دڵنیـاكردنی ۳۰ هه‌زار كه‌س كه هه‌رگیز ناخرێنـه ژێر ره‌حمه‌تی سێ‌وچوار دوكانـداری چاو چنۆك‌و ساخته‌چی‌و بێ ئابڕوو ، به‌ڕاستی چاوچنۆكی‌و ترسنۆكی ڕه‌وشت زه‌قی[۱۹] ئه‌رمه‌نی‌یه‌كانی ئه‌م ناوچه‌یه‌یه!!

دێی « یه‌زیدان » قۆنـاغی حه‌وانه‌وه‌ی شه‌ومان بوو ، ئـه‌م دێیـه چل ماڵێك ده‌بێت ، لـه عه‌شره‌تی كوردی عه‌تامیللی‌ین به‌شی « پیوایان » خه‌ڵـكی دێ‌كه پێشوازی‌و میوان داری‌یه‌كی گه‌رمیان لێ كردین ، ئـه‌م كوردنه قزڵبـاشن ، ئه‌رمه‌نی‌یه‌كان‌و هاوبیره‌كانیان كۆششێكی باشـیان كرد كه ئێمه وه‌ها ڕاگه‌یه‌نین لـه بنه‌چه‌دا ئه‌وانه كورد نین، ئه‌و داوا پڕوپووچه‌م بـه ده‌هـا جـار بیستووه‌و كاوێژ كراوه بۆم .. بـه‌ڵام لـه پـاش چه‌ند كاژێرێك مانـه‌وه‌م لـه‌و دێیه‌داو گوفتوگۆ كردنم له گه‌ڵ خه‌ڵـكه‌كه‌یدا بـه شێوه‌یه‌كی پوخت‌و ڕه‌ها قه‌ناعه‌تم كرد كه تانوپۆ كوردن‌و به‌لایشمه‌وه

سەیرە کە قزلباشن ! لە هەمان کاتیشدا ، ئەم پرسیارە ئاراستەی خۆم دەکەم ـــ

چۆن ئەمانە کورد نین ، لە کاتێکدا بە کوردی ئەدوێن ، جل‌وبەرگی کوردی دەپۆشن ، لەسەر داب‌و ڕەوشتی کوردن ، ئیدی چۆن کورد نین‌و بۆ لە کورد دایان ئەبڕن ؟! جگە لەمانەش لە بنەچەدا دەچنەوە سەر خێزانێکی کورد کە بە [ ئائمالی ] ناسراوان‌و کوردی سونی مەزهەبیشیان تیا هەیە ، سەر خێڵەکەشیان ناوی یەعقوب پاشایەو لە لای ئەمان زۆر بەرێزەو قسەی ڕەوایە ؟ یەعقوب پاشایش پیاوێکی ئاغرو سەنگین‌و قسە خۆشە ... ئەرمەنی‌یەکان دەیان‌ویست بە ئێمەی بسەلمێنن کە جیاوازی ڕەگەزیی‌و نەتەوایەتی لە هەندێك پەیوەندی مەزهەبی‌و ئاینی‌دا خۆی دەرئەخات‌و ئاشکرا دەبێت !! هەندێ لە ڕۆژهەلاتناسە ئەوروپای‌یەکان پەنجەیان بە تایبەت بۆ ئاین ڕاکێشاوە ، لەو بڕوایەدان کە ئاینی ئەمان جۆرێکە لە گومرایی‌یەکی نهێنی ، کە لەم قزلباشانە دەپرسیت لەسەر چ ئاینێکن . زۆر بە ئاسانی وەڵامت ئەدەنەوە کە موسلمانن‌و شیعە مەزهەبن ، کە لە قزلباشێکی لادێی دەپرسیت ئێوە کێن ؟ وەڵامی هەمیشەیی :ـ

« ئەم کرمانجین » .

واتا ئێمە کوردین ، هەتا زۆرتر بیان‌پێچی باشتر خۆیانت پێشکەش دەکەن ، لە جیاتی ئەوەی بڵێن ئێمە قزلباشین ئەڵێن ئێمە (علوی)ن‌و لەسەر پەیڕەوی ئیمامی علی ین ( خوای لێ ڕازی بێ ) ـ وەرگێڕەکان . ) ئەو وەڵامە بە زەقی دەری دەخات کە ئەوان ئانوبۆ کوردو شیعە مەزهەبین .

کوردەکان لەو بڕوایەدان ـ کە قزلباش[20] لە کوردستاندا بەم شێوەیەی خوارەوە سەری هەڵداوە :ـ

لە جەنگی نێوان سوڵتان سلیم و[21] پاشای فارس شا ئیسماعیلی[22] سەفەویدا ژمارەیەکی زۆر لە فروستادە ئاینییەکانی ناردە ئەم ناوچانەو خەڵکیان دڵخۆشی دەکرد بۆ مەزهەبی شیعە ، سوڵتان سەلیمیش بۆ بەرهەڵستی لەو مەزهەبە تازەیە ، چل ڕۆژێ مۆڵەتی دانا بۆ ئەو کەسانەی کە چوونەتە سەر ئەو مەزهەبە ، یاخۆ پێویستە وولات بەجێهێڵن ، بەڵام شیعە کوردەکان ئەوەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد کە بەدەنە شاخ ، قەڵا سەخت و عاسیەکانیان بکەنە شوێنی ململان و جەنگین و ڕووبەڕووی فەرمانی تازەی سوڵتانی عوسمانی ئەو قزلباشانە توانیان مەزهەبی خۆیان هەتا ئەمڕۆ بپارێزن .

لە ئەنجامی گوفتوگۆم لەگەڵ دێنشینەکاندا ئەوەم بۆ ساغ بووە کە ئەوانە بە گیانێ نەتەوایەتی و سوننی مەزهەبی دەمەزەرد کراوون ، ئەوەی بە گشتی لە هەمو ئاقارێکدا هەستی پێ دەکرێت و قووت دەبێتەوە ، ئەم چەند ڕستانەیە :ـ

ئێمە کوردین و ئەمەش نیشتمانی ئێمەیە ، بۆ نەگبەتی تووشی ئەم تورکە ئێسك قورسانە بووین ـ بۆ سوکێتی و تانووت لێدان پیان دەوتن ڕۆمیەکان !! ـ کەی ڕەوای هەقە ئێمە ژێردەستی ئەوان بین ؟ گەلێك زۆردارو دڵ ڕەقن ، ئێمە ئەیان بوغزێنین ، هیوادارین لە چنگی چەپەڵیان خۆمان ڕزگار بکەین .

سلیمان ئاغای خانەخوێمان باسی جەنگی بۆ کردین کە زۆربەی خەڵکی پەنایان بردۆتە بەر شاخەکانی دەوروپشت بۆ ئەوەی ڕاپێچیان

ئەگەن بۆ گۆڕی جەنگ ، ئەو ژمارە کەمەیش کە گیراوون بە سەرباز ، پێنجی‌یا دەمێنن‌و بۆی دەردەچن ، لە کۆتایی قسەکانی‌یا ووتی :ـ
تۆ پێم نالێیت ئێمە چیمان داوە لە تورک‌و جەنگ‌و داواکانی؟!

## [ ٢٦ـی ئاب ]

کەوتینە چەم‌و دۆڵی [ ئاق سوو ] یاخۆ ئاوە سپی ، رومان کردە دێی سەری حەمەن ئاغا ، کە زستانانە هەواری دوو سەرۆك خێڵی سینامیللی‌یە ـ تابۆ ئاغاو ئاسەف ئاغا ، کوردەکان بۆیان گێڕاینەوە کە ووشەی سینامیللی لە چیەوە هاتووە :ـ

نزیکەی ٦٠٠ ساڵێك لەمەوبەر لە ناوچەی ( کانە )کانی زیو لە خەربوتەوە کۆچیان کرد بۆ ناوچەیەکی تر ، لەو ناوچەیەدا گوایا ئافرەتێکی گەنجی دوگیان زیندەچاڵ کرابوو ، لە گۆڕەکەی‌دا منالێکی نێرینە چاوی بەژیاندا هەڵهێناو بە شیری ئەو ئافرەتە ( تەرەزەنە ) گۆش کرا ، هەتا رۆژێك لە رۆژان رەوتەنی‌یەك گوێی لە گریان‌و کروزانەوەی ساوایەك دەبێت ، خەڵك کۆدەکاتەوەو گۆڕەکە هەڵئەدەنەوە ... رۆژان دەڕواو منالە کە گەورە دەبێت ، ژن ئەخوازێ ئەبێت بە دانەری عەشرەتی سینامیللی واتا « گۆڕە خێڵ » .

لە نێو کوردەواری‌دا ، ڕاوە هەڵۆ « ئیسپیر » باوەو بەم شێوەی خوارەوە ڕاو دەکرێت :ـ

کۆترێك بە پەتێکەوە دەبەستن‌و لەسەر هێلانەیەکی هەڵوەشاو دای‌ئەنێن ، لە ژێر هێلانەکەشدا خۆیان حەشار ئەدەن هەڵۆیش کە کۆتر دەبینێت تەماع ئەی‌گرێ‌و خۆی دائەهێڵێت ، بەو شێوەیە دەکەوێتە داوی

ڕاوکەرەوە ، بۆ ماوەی سێ ڕۆژێك چاوی دائەبەستن و ڕووی دەکەنە شینایی ئاسمان ، کە چاوی دەکەنەوە ئیدی هەڵۆیەو کەوی ـماڵی ـ بووە ، بە شەقیش لێی دەیت کێوی نابێتەوە !! کوردەکان تانجی ڕاو ـ کۆجیك ـ یش دەکەن ، لە کاتێکدا نێچیرەکە خزایە چەم و شەخەڵێك تانجی تێ ئەکەن و ئەی گرن •

لە هەمان دێدا ئەرمەنی یەکی قژ خاوی لەبلەبانی زمان لوسمان بینی ، کابرا کەوتە ستایش و پیاهەڵدانی کوردان ، چونکە ئەوان لە چنگی تورکەکان ڕزگاریان کردبوو نەیان هێشتبو سەری ببڕن ، ناوی « گریگۆر پارلاکیام » بوو ، لە مەرعەشەوە هاتبووە ئەوێ ، حەسەن ئاغای باوکی ئاسەف کە یەکێك بووە لە سەرۆکە گەورەکانی سینامیللی ، لە کوشتاری سالی ۱۸۹٥دا رزگاری کردبوو • لەوانەیە ئەم شایەتی یە ڕوون و زەقەی گریگۆری ئەرمەنی بۆ کوردەکان ، سەلماندنی ئەو هەڵوێستە پڕ جوامێری و ئینسانی یەیان • بەرتیلێك بی و بی یەوێ چەردەیەك پارەو پوول لەو دێهاتە کوردانە کۆبکاتەوە[۲۳] کوردەکان دەیان گێڕایەوە کە چۆن لەگەڵ تورکەکان تووشی شەڕو بەیەکادان بوون • لەسەر ئەوەی ئەمان کۆمەڵێکی گەورەی ئەرمەنی یان رزگار کردوە لە چنگی ئەوان ، ئەو کۆمەڵە ئەرمەنی یە ، لە ناوچەی سیواسەوە بە ناوچەی کوردەکاندا هەڵهاتبوون و تەنها سەریان دەرئەکرد ، گریگۆر پارلاکیام خۆی • هەمان بەسەرهاتی بۆ گێڕاینەوەو بگسرە دووپاتیشی کردەوە •

بەو هیوایەی پوختەتر بگەمە بنج و بنەوانی ئەوەی کە جیاوازی لە نێوان کوردو قزلباشدا نیە ، بۆ خەڵکی دێکەم باس کرد کە : ئەوروپای یەکان هاتونەتە ئەم ناوچەیەو ڕایان لەسەر ئەوەیە

جیاوازی یەکی بنەچەیی و ڕەگەزیی لـە نێوان کـوردو قزلبـاشدا هەیـە ، مـن قسەکانی خۆم تـەواو نـەکردبوو ، هەوری توڕەیی و پـەستی کەوتە دەمو چاویان ، بەسەرهات و موناقەشەکانی خۆیان و منیشیان خستەوە ڕوو ، بگرە ئـەمەیشیان لێ زیـاد کرد : ئەگەر جەنگێکی گشتی ی یەخەی کورد بگرێت ـ قزلبـاش بێت یـا سوننی هەموو کورد بـەرەیەکی یەکگرتـوو ئـەبێت لـە ڕووی دوژمنی بێگانەدا ، بەتـایبەتی ئـەگەر دوژمنەکـەش تورکی سننی بێت !! ئـەگەر هەمان بۆچوون و ڕا نجـەینە بـەردەم خێڵی ( ئـاتەمی ) کە لە شیعەو سوننی پێکهاتوون بـەم شێوەیە وەڵام ئەدەنەوە :ـ ڕۆڵـە موسڵمانەکانی شیعەو سوننە برای دینی یەکترن ، جگـە لـەمـەش ڕیخۆڵەیان بە یەکدا بژاوەو ژن و ژن خوازی ئەوەنـدەی تر بای داون بـە یەکداو کـردونی بـە بـرای یـەکدی ، تەنـانـەت ئـافرەت لـە دوای شوکردنی ئـازادە چ مەزهەبێك هەڵبژێرێت و مەرج نی یە بچێتە سـەر مەزهەبی مێردو خەزورانی ، جیاوازی مەزهەبی هەرگیز دووبـەرەکی لـە نێوان کوردا دروست نـەکردووە ، بۆ نمونە :ـ یەعقوب پـاشـای سـەر خێڵی [ئـاتەمی ] کە سوننی مەزهەبە ، کچی تـاپۆ ئـاغـای سـەرخێڵـی سیناميللی شیعەی هێناوە بۆ کوڕەکەی ، ئـەم خزمایەتی یەیشی بـەم نزیکانە تـەواو بـووە .

نـاکۆکی و بوغـزاندنی کوردو تورك مەسـەلەیەکی ئـاشکرایە ، تـەنـا نەت لەکاتی جەنگیش دا بە یەکادان و کوشتار لـە نێوان کوردەکان و ئـەو دێ تورکانەدا کـە تازە هاتبونە ئەم نـاوچە کوردانەوە دەقەومـا .

چـەتـە کوردەکانیش سەرلەنوێ دەستیان داوەتە چـەپـاوو تـالآن کردنی کاروانی تورکان ، چـەتـە تورکەکانیش کـاروانـی کوردانیـان خستۆتە ژێر هێرش و پـەلامـار ، زەق ترین هۆی بێزاری لـە تورکەکان

ئەوەیە کە عەقڵ زبرو لووتبەرزو عەنات زلن ، بە سووکی تەماشای هەموو غەیرە تورکێك دەکەن •

جگە لەوانەش ‹ لە هاومالّیو دراوسێیەتیدا پووچەڵنو هیچ کەلکی هاوسێ ناگرن ، پێویستیت بەوە نییە کە خۆت بڕەتێنیت ، تەنها سەر داوێك بە ئاستەم بدەرە دەست کوردێك قولایی دەروونت بۆ دەکاتەوە ، خەشی دڵی خۆی دەمرێنێت بە تورکو ئازارەکانیو دەوڵەتە بۆگەنەکەیان!!

ئەم پەندەی خوارەوەم لە پیاوێکی بەتەمەنی کورد بیستووە کە هەتا ڕادەیەك دەری دەخات بۆچی کوردەکان ژنو ژنخوازی لەگەڵ تورکەکاندا ناکەن ؟

[ سیان لە میان بانز نادەن ] واتا : هیچ ناچێتە عەقڵەوە گورگو مەڕ ببنە ئاشنا •

## [ ٢٧ـی ئاب ]

ئەمڕۆ بەرەو هاوینەهەواری عەشرەتی سینامیللی کەوتینە ڕێ ‹ ڕێگاکەمان ئەیبردینە سەر لوتکەو چەمو دۆڵی « ئاوەسپی » ، لەوێشەوە سێ هەزار پێیەك بەرەو ژوور هەڵدەکشێین ، سوورە چنارو دارستانی چڕ ئەو ناوچەیەی کردبووە سێبەرێکی کۆك ، لە شوێنێکەوە شۆڕ ئەبینەوە ، کە پێنج هەزار پێ لە دەریاوە بەرزە شاخێکی لێژوو تووشە ، ناوێکی شیرینی تێجگار زۆر هەڵئەقولێو ناڵە دەکاتو بوەتە سەرچاوەی چەند کانییەکی دیکە ، لە دوای شەکەتیو ڕێکردنێکی دوورو درێژ ، کە (١٢) کاژێریکی خایاند گەیشتینە هەوارگەی تابۆ ئاغای سەرخێڵی سینامیللی ، ناوی خۆی لە راستییا خەلیل ئاغایە ، بە سیمایدا وا دیارە لە هەرەتی لاویدایە ، گۆشتنو تێکسمراو بووە ، هەر لەو کاتەوە

ناونراوه بە « فاتی » و « تاپۆ » ، ئەم پیتکەو ناتۆرەیە بە سەریا سەپاوە، لەناو کوردەواری‌دا ناوو ناتۆرە لە یەکترناان شتێکی ئاسایی‌و باوە[٢٤] ، بۆ ونمونە :ــ « کوتو » بۆ بچوکە ، « کولو » بۆ شەلە یاخۆ گۆج ، « کیتو » بۆ تونکە چەپو بۆ ..

تاپۆ ئاغا خانووبەرەیەکی هاوینەی زۆر جوانی دروست کردبوو، دیوەخانەکەی بەربلاو ، دیوارەکانی لە خشتی سوور دروست کرابو ، لە حەوشەکەیا ئاوێکی ڕوونی چاو قرژاڵی هەڵئەقولا ، ئەڵقاو ئەڵقی ئاوەکەش بە کورسی بەرگ حەریر گیرابوو ، بنمیچەکەیشی بە دار سنەوبەرسەری گیرابوو ، دیمەنێکی تێجگار قەشەنگی هەبوو . ئەم خانوە هاوینەیەی لادێ، باشترین خانووی سەرخێڵە کە تا ئێستا تووشی هاتبم ، ئەوە دەگەیەنێت، کە کورد خاوەنی چێژو شارستانیەتێکی دێرینی ڕەسەنن .

مارك سایکس[٢٥] لە بارەی کوردە سینامیللی‌یەکانەوە نووسیویە دەڵێ:ــ

سینامیللی‌یەکان تۆزو پۆشتەن ، دڵپاکو خاوێنن ، لە جوتیاری‌دا ئازاو کارامەن ، لە دروست‌کردنی خانوبەرەی خۆیاندا خاوەنی هەستێکی هونەری ڕەسەنن .

تاپۆ ئاغا بە دوورو درێژی بۆی باس‌کردین کە چۆن هۆزەکەی پەنای ئەرمەنیەکانی داوەو لە چنگی مردن رزگاری کردوون ، قائمقامی ( .... ) لە بنچەدا لبنانی بووەو کوردەکانی زۆر خۆش ویستووە ، کە ئەرمەنیەکان لە مردن خۆیان قوتار ئەکردو بەرەو کوردستان ملیان دەنا ، ئەو قائمقامەیش کوردەکانی هان ئەدا بۆ حەشاردانی ئەرمەنی‌یەکان عەشرەتی سینامیللی (٦٠) ئەرمەنی لە ژێر باڵیانا حەوانەوەو لە مردن رزگاریان بوو، کە ئەفسەرو کاربەدەستە تورکەکان ، هەڵوێستی خانەدانی‌و

مرۆڤانەی کوردیان زانی بەرامبەر ئەرمەنی یەکان بە پەلە فەرمانیان دەرکرد
کە بە[illegible]یان سزای ئەرمەنی یەکان کوردەکانیش سزا بدرێن !!

وەکو تاپۆ ئاغا بۆی گێڕاینەوە ، ئەم قائممقامە لبنانی یە[26] هۆیەکی کاریگەر بوو لە پووچەڵکردنەوەی ئەو فەرمانەو خرایە پشتگوێ بە رادەیەك چووە خانەی سفرەوە .

خێڵەکانی سینامیللی گەرمیانو کوێستان دەکەن ، بەڵام نەك بە شێوەی عەشرەتەکانی هەکاری و جاف[27] ، هەمو خێزانێکی سینامیللی لە هەوارگەی زستاندا زەوی و دەشتی خۆی هەیە، جگە لەمەش سێ چارەکی ئەم عەشرەتە خانووبەرەی باشیان هەیە ، لە هاوینیشدا وەك خێڵە گەڕۆکەکانی تر نین سەرومڕ بگەڕێن بە شوێن ئاوو لەوەڕدا ، بەڵکو زۆربەیان پارچەیەك قەدەغەی بۆ لەوەڕگا هەیە جگە لە زەوی بەربڵاوی تەلانەکان کە ئەی کێڵنو دەیکەن بە ووشکەدان ، زەوی تەلانەکانیش بە هێزترە لە زەوی دەشت ، ڕێژەنی ووشکەدان یەك بە پازدە یەو لە دەشتیشدا یەك بە دەیە ، لە هاویندا زەوی دەکێڵن ، لە سەرەتای ئابەوە تۆو ئەکەن ، لە یەکەم بەفر باریندا تەمەنی بەر هەمیان چەند هەفتەیەکە ، لە ژێر سەرپۆشی بەفردا کشتوکاڵیان ئەمێنێتەوە ، هەتا لە تەموزی ساڵی ئایندەدا یەتە بەرهەم ، چڕی و تەسەلی تۆوکردن کە پێوەری بەپیتی زەوی یە لەوەدا دەرئەکەوێت کە چەند دەنکە تۆو هەڵئەوەرێتە سەر لەشی گاکان کە ١٥ـ٢٠ دەنکە تۆوە ....

جوتیاری ئەم ناوچەیە لە ڕۆژێکدا ١٦ کیلۆ تۆو زیاتر دەکەن ، لە دەشتا ئەتوانرێ دوو ئەوەندە تۆو بکرێت .

( بەراوردی ناوچەی سولەیمانی بکە کە لە باشترین کەشدا ٣٠ کیلۆ تۆو ئەکرێت ) .

مێژووی بەسەرهاتەکانی ئەم خێڵانە ـ وەك خۆیان دەی گێڕنەوە ـ مۆرکی نـاکۆکی‌یەکی دێرین‌و ڕەگداری پێوە دیـارە ، ئـەم ڕووداوەی خوارەوە باشترین شایەتە ، ڕوداوەکەیش ئەمەیە :ـ

بیلال پـاشـای بـەنـاو بـانگ کـە تورکەکان پێ‌یان دەوت [ قـەرە بـلال ] ، یەکێك بووە لە باپیرانی تاپۆ ئـاغـا ، خۆی‌و چـەنـد خێزانێکی کـورد لـە دێـر زەمانەوە لـە خـەربوتـەوە کۆچیان کـردووە ، قـەڵاو هەوارگەکانی ئێستەیان کـردووە بـە شـوێن‌ی ژیانیـان ، ئەو قـەڵاو هـەوارگانەی کـە جاران ژێردەستەی خێڵێکی ڕەوەندی تورك بوون کـە بـە ( ئیلی بەگلەر ) بـە نـاو بـانگ بوو ، سەرخێڵی بـەگلەر چما وێڵی نواندو ئەو کوروانەی کە تازە هاتبونە ئەو نـاوچەیە بـانگی کردنە سـەر میوانداری ، ئەوانیش بە سنگێکی سافەوە میوانداری بەگلەریان قبوڵ کرد ، لـە پـاش ماوەیـەك وە لـە پـاداشتی ئەو میوانداری‌یەی خێڵی بـەگلەردا کوردەکانیش هەمو خێڵە تورکەکانیان بـانگ کـردە سـەر میوانـداری‌و گەنجێکیان ڕاسپاردە لای تورکەکان ، کـە خوان ئامادەیەو بفەرموون .. بـەڵام تورکەکان ئـەو دەعوەتەیان ڕەد کردەوە ، بەم شێوە نـاشایستەیش لـە ڕووی گەنجە کوردەکەدا وەستانەوە :ـ نـاشێ ئێـوە بـە تەمای ئەوە بن کـە ئێمە بچینە سەر خوانی چەن کوردێکی شوان‌و نەزان ؟!

ئـەو شەکرە کـە شکاندیـان گەنجەکەی دەمارگیرو تووڕە کـرد بـە لیسەوە هەڵمەتی دانێ‌و (٣٠) کەسێکی لێ کەلەلا کردن بۆ سڕینەوەی ئـەم پەن‌و بەدناوی‌یە ، تورکەکان دەکەونە پەیجۆری تۆڵەسەندنەوەیەکی بـەربلاو لـە دراوسێ کوردەکانیـان‌و قەڵاچۆکردنیـان ، بەڵام هەندێك لـە پیـاوە زیرەکانی ئێلی بەگلو سەرخێڵەکەیان پـەشیمان دەکـەنـەوەو پـێ‌ی دەڵێن :ـ بـۆ ئێمە شورەیی‌یە هێرش بـەرینە سـەر هۆزێك ، کـە

تەنها یەکێکیان ٣٠سی‌ی لە ئێمە شەل‌وپەت بکات‌و زاڵ بێت بە سەریاندا!!
ئەوە باشترە کە بارکەین لەم ناوچەیەو هاوسێ‌یەتی ئەو کوردانە نەکەین ، لەو کانەوە ئەم ناوچەیە بە دەست کوردەکانەوەیە .

## [ ٢٨ ــ ی ئاب ]

زمانی کوردی بریتیە لە چەند دیالیکت‌و لەهجەیەك کە ئەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ جیاوازی‌یان هەیە بەڵام لەهجەی عەشرەتەکانی باباکوردی بە ئاستەم جیاوازە لەگەڵ لەهجەی کرمانجی‌دا ، هەرگیزیش ڕاست نیە بچینە سەر ئەو ڕایە کە جیاوازی دیالیکت لە کرمانجی‌دا ئەوە دەگەیەنێت کە لە کرۆك‌و بنەڕەتیشدا لە یەك جیان ، چونکە بۆ نمونە :ــ ئەوانەی لەگەڵ من‌دان کوردی بۆتانی‌و دیاربکری‌و هەکاری‌ن‌و کەچی زۆر بە ئاسانی لە یەکتر دەگەن ، جگە لەمەش خەڵکی ئەم بەشە دوورەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش لەوان دەگەن ، تەنها چەند هەفتەیەك پێویستە ئیدی دەبن بە خەڵکی ئەو شوێنە ، هۆی زۆربەی جیاوازی‌یەکان دەگەڕێنەوە بۆ گۆڕان لە دەنگی پیتی نەخۆش‌دا بۆ نمونە ووشەی دایك [ دای ، دا ، دی ]م لێ بیستون ، « وای » وەك ووشەی ترای ئینگلیزی دەوترێت . دیارە ئەو جۆرە شتانە بۆ بێگانەیەك تۆزێك ئالۆزی دێنێتە کایە ، زۆر گرانە بۆ یەکێکی بێگانە کە گوێ‌ی بەم دەنگە جۆر بەجۆرانە ئاشنا نە بووە ، ئەو بێگانانە بە هەڵە مەسەلەی جیوازی لەهجەکان گەورە دەکەن‌و فووی تێ دەکەن ، چونکە کردارو ئاوڵ کردارو تەواوکەرو هەندێك ووشەی دیکە ، بەردەوامو لە زۆربەی شوێنەکاندا دەگۆڕدرێن ، بۆ نموونە ووشەی «ئێستا» بە لەهجەی سلیمانی ، بە لەهجەی هەکاری‌و ئەنگۆ بە لەهجەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ،

جگە لـە هاو نـاوی تریش وەکو « ئیستاها » ، « ئەنیگا » ، « نیکا » ، کەواتـا ئـەوەی تۆزێك بنـەمایەکی باشـی بێت لـە زانینی لەهجەی ناوچەیەکدا زۆر بە ئاسانیو خیرایی فێری لەهجەی نـاوچـەکانی تریش دەبێت ، بـە مەرجێك لیستەیەکی کورت لە ووشـە بـاوو گشتییەکان لەبەر بکـات ، ئـەوەی شیاوی بـاسـە بە لەهجەی نـاوچەی سـلیمانی دەڵێن بـابـا کوردی ، لـەهجەی بۆتـان « بۆهتی » ، بـە لەهجەی نـاوچەکانی تـری کوردستانیش دەڵێن « کرمانجی » ووشـەی کوردی »یش زاراوەیـەکی گشتییە بۆ جیاوازییە سەرەکییەکانی زمانی نەتەوەیی (لـەگـەڵ زمانی نەتەوەکانی ترا ـ وەرگێڕەکان ) بەکار دەهێنرێت ، بە تایبەتی ئـەوە سـەرنجی ڕاکێشـام کە پیتـە عـەرەبییەکان کاوانینو بـە فریای هەموو پیتـە نەخۆشـەکانی کوردەوە ناچن .

منو ئەندامەکانی تری وەفدی کورد گەلێ جار هەڵبەستی کوردیو پـەندی پێشـینانی نـاوچەکانمان لەلای خۆمـان نوسیوە ـ ئەوان بـە پیتی عەرەبیو منیش بە پیتی لاتینی ـ هەرچەند من ئـارەزاییـەکی وەهـام لـە زمانەوانیدا نیـە ، بەڵام دەمتوانی ئەو شیعرانە بە ڕەوانیو دەنگی بـەرزو لـەوان ڕەوانتر بخوێنمەوە . زۆربەی گەنجەکانی کـورد دەزانن چ پیتێك دەگونجێ بـۆ دەنگی زمانەکەیان . بـەلام ئـەوەی پێشووتر بە تایبـەتی پیرەکانو پیـاوە ئـاینییەکان دژن بەو شتانەو بە سەرپێچی کردنی دائەنێن لـە بنـەمـا ئیسلامییەکان .

بۆ ئەوەی بەراوردێکی گۆڕانی لەهجەکان بکەم ، کورتە چیرۆکێکم وەرگێڕایە سـەر زۆربەی لەهجەی ئەو خێلانـەی کـە چـووبـوومـە نـاویـان[٢٨] .

# [ ٢٩ ـ ی ئاب ]

بەیانی زوو بۆی دەرچووین ، بە دوو رۆژ گەیشتینە هەوارگەی یەعقوب پاشا کە سەرخێڵێکی تری کوردەکانی عەشرەتی (ئاتەمی)یە یاخۆ وەك تورکەکان دەڵێن « ئاتمیللی » ، لە سەرەتاوە پێویستە لەوە بگەین کە زۆربەی ئەو زاراوانەی لەم دێهاتانەدا بەکار دەهێنرێت ـ وەك لەسەر نەخشەکە ڕوون کراوەتەوە ـ زاراوەی تورکین چونکە نەخشەکانی ئێمە بە گشتی‌ی پشتیان بە نەخشەکانی تورك بەستووە ، لەگەڵ هەندێك ڕاپۆرتی گەڕیدە ئەورووپایی‌یەکاندا کە زمانی کوردی‌یان نەزانیوەو دیارە یەکدوو پۆلیسێکی تورکیش خراونەتە خزمەتیان !! ئەگەر تۆزقاڵێك لەو زاراوانە بکۆڵینەوە ، بە ڕوونی دەردەکەوێت کە لەبنەڕەتا کوردی‌نو بە فەرمانی دەوڵەت کراون بە تورکی !!

لە گەلێ شوێن‌دا ووشە کوردی‌یەکان بە باری تورکی‌دا کلك‌و گوێ کراون ، بۆ نمونە « ئاتەمی » کراوەتە « ئاتەمیللی » ، هۆرتان کراوەتە ( هوتلو ) ، کاران کراوە بە ( کارلو ) ، لە هەندێ شوێنی تردا دەقاو دەق ووشە کوردی‌یەکە دەکەن بە تورکی‌و بەکاری دەهێنن ، بۆ نموونە لەجیاتی « ئاوە سپی » ( ئاف سو )ی تورکی ، لە جیاتی کاشان ( توپراك ) بەکار هاتووە .

ڕێگەکەمان ئاڵاوەتە ناوچەیەکی ناش‌و هەلاێر زۆر سەخت‌و تووشە ، لە هەندێ شوێن‌دا تل‌و بەردی شاخەکە ڕێگەکەشیان بزر دەکرد ، کاتێکت دەزانی لە چەم‌و دۆڵێکی تەسك‌و قووڵەوە سەری هەڵئەداو ئەیدایەوە لاپاڵ‌و نبارەکان ، سنەوبەریش بە گەڵای سەوزی مەیلەو شینی ، بەلق‌و بۆبی پاکی ، بە قەدو باڵای شوخی‌یەوە، ئەوەندی تر

ئەو ساوەی کردبوو بە بە هەشتی بەرین ، یەعقوب پاشای خانەخوێمان ١٠ دە کیلۆ مەترێك هات بە پێشوازیمانەوەو هەتا هەوارگەیەکی بچووکی عەشرەتەکەی مایەوە لە گەڵمان ، هەر لەوێ نانو خوانێکی گەورەی بۆ ئامادە کردین ، بەر لە نان هێنان داوام لە یەعقوب پاشاکرد خەڵکی دێ کۆبکاتەوەو بۆ یادگار وێنەیەك بگرین ، لە پاشا لێی پرسیم : ئایا حەز دەکەیت ئافرەتانیش لەو وێنەیەدا دەربچن ؟

وتم : ئەگەر بەلای تێوەوە ئەنگ نیە منیش ئارەزووم لێیەتی .
وەڵامی دامەوە : ئەنگی ؟! بۆچی عەیبە ؟ ئافرەتی ئێمە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئافرەتی تورکەکاندا .

هەر لەم کاتەدا پیاوێکی ڕدێن سپی لە کۆڕەکەدا هەڵیدایەو وتی :ـ ژنە تورکەکان چارشێو « پەچە ـ وەرگیر » دەپۆشنو دەمو چاویان دەشارنەوە ، بەڵام کراسەکانیان ئەرازێنەوە ، ژنەکانی ئێمەیش بە پێچەوانەی ئەوانەوەن[29] ، لە ڕاستیدا کوردەکان لە مەیدانی ڕەوشت بەرزیدا شۆرەتێکی بەربڵاویان هەیە ، (میللنجی)[30] لەکتێبی ( ژیانێکی ساکار لەناو کوردانئدا ) باسی کردووە کە ژنانی کورد گەلێ کارامەو ڕەوشت بەرزو ئەغرو سەنگینە ، هەرگیز لە هەلسو کەوتیانەوە ترتنۆکی ژنانی ئەرمەنیو دەم هەراشیو پیسی ژنانی عوسمانی (تورکی) بەدی ناکرێت ، ڕەوشتیان ئێجگار بەرزەو سوکترین هەڵە کە شەرەفی ( ژیانی خێزانی )یان لەکەدار بکات سزاکەی کوشتنەو ئەمە بۆتە یاسایەکی خۆیان ، ئەم سزایە بەسەر هەردوولای تاوانەکەدا ( چژن چپیاو ) ئەنجام ئەدرێت . لە فەرهەنگی ووشە کوردییەکاندا ووشەی « زانیە » نیە ، لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا ووشە فارسییەکەی بەکار دێت ، لە ناوچە

ڕۆژئاواکاندا ووشە تورکی‌یەکەی ، لـە نـاوچە باکووری‌یەکاندا ووشە ڕوسی‌یەکەی ، لە ئـاوچە بـاشووریەکاندا ووشە عەرەبی‌یەکەی ، بـەڵام لـە هەموو نـاوچە کوردی‌یەکاندا بـە « تەشەر » نـاوی ئـەو ووشـەیـە دەبرێت ، کوردەکان کـە بـاسی یەکێ دەکـەن زۆر ئـازابێ‌و خـاوەنی شـان‌و بـاهوویەکی سروشتی بێت ، دەڵێن وەك هـەرزەکارو جاحێلێکی ڕەبـەنـە .

کـە ماڵئاوایی‌م لـە پیاوێکی پیری سیناسیللی کرد ئەملاولای مـاچ کردم ، ماچێکی پڕ لە خۆشـەویستی‌و دڵپـاکی !! بـە هـەرحاڵ چـەنـد بەگەرمی‌و ڕێزەوە پێشوازی‌مان لێ‌کرا ئەوەندەش لە خاکی کوردەواری‌دا ماڵئاوایی‌مال لێ‌کراو بەرێ کراین .

زۆر ئاشکرایە لەلای هەمو گەڕیدە ئینگلیـزی‌یـەکان ، ئـەوانـەی هاتونەتە کوردستان ، کە بە چ گیانێکی پـوخت‌و پڕ لە خۆشـەویستی‌و ڕێزەوە پێشوازی‌یان لێ‌کراوە ، کوردەکانی نیوان دوو ڕوباری فـرات‌و جیمون[٣١] میوانیان گەلێك ـ خۆش دەوێ وپێشوازی گەرمی لێ‌دەکەن . میستەر مارك سایکس باسـی ئـەوە ئەکات کـە کوردەکان هاوڕێ‌یـەتیـان خۆشـەو لـە ئەوروپی‌و غەریبە گەلێك ڕێزدەگرن .

لـە بـەرگی چـوارەمی «ڕاپۆرتی سـەربـازی»دا سـەبـارەت بـە نـاوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیای ئاسیاوە بەردەوام ئـامۆژگاری دەکرێ‌و ڕوونی دەکاتەوە کە کوردەکان زۆر خاوێن‌و دڵپـاك‌و مەشرەف خـۆش‌و میوان پـەرستن ، لەو ڕاپۆرتەدا کە موخابەرات لـە قاهیرە چاپی کردووە، لـە بـارەی کوردەکانی بـاشـووری سوریاوە ئەمە نوسراوە :ـ لـــە تـاریکی‌یەکی ئەنگوستەچاوی خەست‌دا ئەتلێنەوە ، لـە هەمان کاتیشــدا گەلێك پـاك‌و ڕەوشت بەرزو میوان پەرستن .

لەپاش رۆژێك ڕێبڕین گەیشتینە دەربەندێکی تەسکی بچووك کە بە « گەلیا نوقراخ » ناسراوە ، لە لوتکەی ئەم دەربەندەدا پاشماوەی قەڵاو سەنگەرێکی دێرین دەبینرێت ، وەها شۆرەتە کە ئەو قەلاو سەنگەرانە کوردەکان دژی دەستدرێژی تورکەکان بەکاریان هێناوە ، لە شێواندا لاماندایە دێی نوقراخ ، ئەم دێیە دەکەوێتە باکووری دەشت نوقراخ ، بەقسەی تورکەکان ئەم دێیە هی خۆیانەو زەوی‌و زاریش هەر ئەوان دەی‌هێننە بەرهەم ، تورکەکان خۆیان دەڵێن ئەم دێیە وەك دورگەیەکە لە ناو دەریایەکی بەربلاوی کوردەکاندا‌و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان داوە ، ئەم تورکانە زۆربەیان بە کوردی ئەدوێن‌و پەیوەندی‌و هاوماڵیان لەگەڵ کوردەکاندا باشە چونکە بەرژەوەندی تورکەکان لەوەدایە کە باش‌بن لە ناو ئەو هەموو کوردەی کە گەمارۆی داوون .

ئەحمەدی سەرۆکی ئەم دێیە بۆی گێڕامەوە کە لە کاتی هەندێ شەڕو شۆڕی بچوك‌و تالانی کەمدا کاربەدەستانی تورك هیچ قسەیەکیان ناڕوات‌و دەخرێنە پشت گوێ ، پەیوەندی ئەکرێت بە دوو سەرۆك هۆزی گەورەی کوردی ئەم ناوچەیە تاپۆ ئاغاو یەعقوب پاشا ، لە دوای پرسوڕا بەیەکدی کردن چارەیەك بۆ گیروگرفتەکان ئەدۆزنەوە . خەڵکی ئەم دێیە بێزاری‌یەکی زۆریان لە حوکومەتەکەی خۆیان دەربڕی ، بە تایبەتی بۆگەن بوونی دادگاکان‌و بڵاوبوونەوەی بەرتیل خۆری لەو دادگایانەدا ، دانیشتوانی ئەم ناوچەیە ئاگایان لە مەحموی بێزووان نی‌یە کە لەوانەیە بەم نزیکانە بکەونە ژێر دەستی بێگانەوە ، کە ئێمە بارو دۆخی ئەو رۆژەمان بۆ شی کردنەوە دەیان ووت :

لەلای ئێمە گرنگ نی‌یە کێ حوکمی وڵات دەگرێتە دەست ، ئەوەی

بەلای ئێمەوە گرنکە دەزگاو دووکانێك بێتـە کایەوە کـە دادپەروەر بێت، لەوانەیە ئەم هەستی دەربەست نەبوونەیان لەوەوە هاتبێت کە ئەمانە تورکی شیعە مەزهەبن و ئەمەش بە نیسبەت تورکەکانەوە شتێکی زۆر دانسـقەیە، ئەو سەر ژمێرەی کە لـە خەڵـکی ئەم نـاوچەیەم وەرگرت متمانەم پێی نەبوو، بۆیەکا پێویستبوو خۆم زۆرتر بڕەتێنم هەتا بـاشتر بگەمە ناخـی دەرونی ئەم دێنشینانە، لە ڕۆژی دوای‌دا بۆم دەرکەوت کە لە سەرەتاوە ئێمەیان بەکاربەدەستانی تـورك زانیوەو گـوایا هاتـووین بـۆ پـارەو • و ڕاووڕووت و خەڵەتاندنیان، لەبەر ئەو هۆیە نەناو خۆیاندا بڕیـاریان‌دابوو کە هیچ زانیاری‌یەکی ڕاستمان لـە بـارەی زینەماڵ و شتی‌ترەوە نەدەنێ، لێمان پرسین کـە بۆچی خراپ لـە ئێمە گەیشتبوون و بـەکاربە دەستانی تورکیـان زانی‌بووین • ووتیـان ئـەوەی چـەواشەی کردبووین ئەمەبوو کـە تورکی‌تـان بـە ڕەوانی دەزانی و بەرگ‌وپۆشـاکیشتان دەچـوونەوە سـەر جل‌وبەرگی ئەفەندی‌یە تورکەکان • سەرباری هەموویش هەندێك چەکداریشتان لەکەڵا بوو !!

چ زەمینەیەکی خۆشـە بۆ ڕاووڕووت و تاڵان‌کردن !!

ئـەم خشتەیەی خوارەوە ئەوە دەر دەخات کە جەنگ چ کارێکـی دژواری کردۆتـە سـەر ئەم دێیە :-

| | | |
|---|---|---|
| ژمارەی ماڵـەکان | ٢٠٠ | ٢٠٠ |
| ژمارەی جوتەکان | ١٥٠ | ٦٥ |
| زینـەحـاڵ | ١٠٠٠٠ | ١٠٠٠ |

جوتێ‌گا خۆی بڕەتێنێت ٧٠٠ کیلۆ تۆوی کردووە، ژمارەی ئەوانەی•

بەزۆر کێشکراونەتە کۆڕەکانی جەنگ ٤٠٠ پیاون ، ئەوا ساڵی ١٩١٩ خەریکە تەواو دەبێت ـ واتا ساڵێك زیاترە جەنگ کۆتایی هاتووە ـ هەتا ئێستایش تەنها چل پیاو گەڕاونەتەوە شوێنی خۆیان ، دەستکەوتی ئەو پوڵ و پارەیەی کە لە جوتیاریی و کشتوکاڵی دەهێنرێتە مایە سەد هەزار قرۆشە ، واتا نزیکەی ( ٣٠٠ ) پاوەندی ئیسترلینی یە ، لەوەتێ دەگەین کە ٢ پاوەند باج خراوەتە سەر هەر خێزانێکی دێ نشین .

ئەم باجە لە چاو داهاتی جوتیاران لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی پێش جەنگدا قەبەو زۆرە .

وەرگرتنی باج بەو شێوەیە کار دەکاتە سەر باری گوزەرانی خەڵك ، چونکە ئەگەر جووتێك گا بایی (٥) پاوەند پەیدا بکات پێویستە (٤) تەن بەرهەمی هەبێت ، دەولەتیش هەشتیەکی بەرهەم دەبات بە باج ، لەمەوداویش ئەو ڕێژەیە دەبێت بە نیوە چونکە لەم کاتەدا هەشتیەکەو بە دە پاوەند ، ئەوەیش لەیاد نەکەین کە جوتیارەکان ئەو باجە لەبەرهەمی ترێ و میوەهاتی تر تەواو دەکەن کە بایی دە پاوەندێك و بگرە زیاتریش دەبێت .

بەو جۆرە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە حوکومەتی تورکی لە مامەڵەو کردەوەی ڕۆژانەی لەگەڵ جەماوەردا ، هیچ قازانجێك ناکات لە زیان زیاتر ، بەڵام ئەوانەی دەستەبەری ـ قۆنتەراتی کۆکردنەوەی ئەو باجانە دەگرنە ئەستۆ ، گەلێ زۆرتر قازانج دەکەن ، بەراستی لەوە نەگەیشتم کە ئایا دێ نشینەکان بەشە باجی خۆیان ـ ئەدەن بە دەولەت ، یاخۆ بە کەم و کورتیی و چەپو گۆڕێکی تیا دەکەن ؟ بەڵام لەوە گەیشتم کە جوتیاری دێهاتە کوردنشینەکان،

ئەو باجە قەبەو زۆرە هەرگیز بە تەواوی نادەن بە دەوڵەت ، بگرە قۆنتەراتچی‌یەکانی باجیش هەمیشە بە تەمای پووڵێك نین ئەگەر ئاغاکانی ناوچە نەکەن بە هاو بەشی خۆیان لە باداشتی ئەوەدا کە جوتیارەکان بە قسەی ئاغا دەکەن‌و باجەکان بە پوختی ئەدەن بە دەوڵەت .

یاسای کۆکردنەوەی باجەکان لە هەموو قوژبنێکی ئیمبراتۆریەت‌دا خراوەتە گەڕ ، بەتایبەتی بەر لە جەنگ‌و لە کاتی جەنگ‌دا ، چونکە سوپا پەرێشانە بۆ گەنم‌و ئالیکێکی زۆر زۆر ، لەبەر ئەمە بوو باج بە شتومەکی وەرئەگیرا نەك بە پارەیی . دەوڵەت بەر لە کەش دروێنە پیاوەکانی ئەناردە لادێ‌کان ، بۆ ئەوەی دۆخی ووشکەدان‌و کشتوکاڵ خەمڵ بکەن‌و بەشی دەوڵەت دیاری بکەن ، ئەو ساڵانەی کە ووشك‌و کەم ڕێژەن بوون دەوڵەتی تورکیا تووشی قاتەو گرانی‌یەکی سەخت دەبوو . ئەو کەسانەی کە بە سەوزی بەرهەمیان دەقەبلاند گەلێکیان دەست‌و دەم پاك نەبوون ، چونکە لە گەڵ ئەملاولادا زێر بە زێری ڕێك دەکەوتن ، لەو ناوەشدا هەر دەوڵەت زەرەری دەکرد .

لە دوای جەنگ یاسای قەبلاندنی باج خرایە پشت‌گوێ‌و یاسای کۆکردنەوەی باجی کشتوکاڵی پێش جەنگ کەوتەوە ئیش ، بێ‌گومان ولاتێك ئاسایشی تیا نەبێت ، بۆ دەرمان بگەڕێی کادرو کارامەی تیا نەبێت ، دیارە لە باوو دۆخێکی وەهادا کشتوکاڵ[٣٧] لە هەموو شتێك قازانجی زۆرترە بۆ دەوڵەت ، ئێمەیش کە بمانەوێت ئەم ولاتە دواکەوتووە بگرینە دەست لە سەرەتاوە هەمان ڕاو بۆچوونمان دەبێت‌و کشتوکاڵ بەرە پێ‌ئەدەین .

نەخۆشی‌یە کوشندەکانی ئەم یاسایە لەوەدایە هەمیشە بە پەرۆشەوەیە گیرفانی ئەفەندی‌یە پیس‌و چاو چنۆکەکانی شار پڕ بکات لە پول‌و پارە ، بەڵام گەلێ بە پێویستی دەزانێت مەرایی‌و خوتکی بۆ سەرۆك هۆزەکان‌و خاوەن زەوی‌یەکان بکات ، هەر چۆنێك بێت من لەو باوەڕەدام کە ئێمە بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ دەبین بە مەرجێك بەر پرسیاری باڵای[٣٣] ئینگلیز ئازادبێت لە هەلس‌و کەوت‌و بڕیار دانا ، دیارە پێویستە هۆشیاریش بێت‌و بەرزترین نرخ نەدات !! هۆی بچووك بوونەوەی کۆڵ‌و باری ئاو بازاڕ ئەوەیە کە نرخی گەنم ١٤ جار لە نرخی پێش شەڕ زیاتر بووە ، سێ‌یەکی پێویستی‌یەکانی دەوڵەتیش پارەی حازری پێشەدرێت، ئەمەش خۆی لە خۆیا دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی نرخی پارە بە رێژەی چل جار زیاتر لە نرخی پێش جەنگ . لێکدانەوەی تورکەکان زۆر کۆڵ‌و نەفامانەیە ، بەڕادەیەك بیر لەوە ناکەنەوە کە بەرزبوونەوەو فڕینی نرخ ئەنجامی چی ئەبێ‌و سەر لەچی‌یەوە دەردەکات ؟! ئەو رۆژە زۆر سارد بوو بەلامانەوە کە هێشتا ئێمە لەمانگی ئابداین کەچی باران‌و تۆف ، سەرو دڵی گرتین ، خەڵکی دێ دەیانووت باران باریە لەم کاتانەدا شتێکی سەیری‌یە ، هۆی بارانی لە ساکاوی ئەم کاتانە بەلای ئەوانەوە ئەوەیە کە نزیکی لە شاخی ( نوقراخ )ەوە کە ١٠ هەزار پێ یەك لە دەریاوە بەرزەو لووت لە ئاسمان دەسوێت ، ئەوەشیان بۆ گێڕاینەوە کە ساڵی پار لە تەموزدا سەرومڕ سێ‌رۆژ بەفر باری‌وەو نزیکەی سێ پێ بەفر لە زەوی‌یەوە بەرز بووەتەوە ، زۆربەی ئاژەڵ‌و گاو گوتاڵی لەناو برد .

خەڵـکی ئـەم دێیە لـەو بـاوەڕەدان کـە شاخی نوقراخ کانزای نخاوی ( خامات معدنیە ) تیـا هەیەو تیشك ئـەدەنـەوە ، گوایـا بـــەو تیشکدانەوەیە مرۆڤ بەبێ چورتمو هەڵگوتن دەگاتـە سەر لوتکەی شاخی نـوقـراخ .

## [ ٣٠ ـ ی ئـاب ]

ئـەمڕۆ بـەرەو هاوینـە هـەواری یـەعقوب پـاشـای سەرەك خێڵی ئـاتـەمی دەڕوین ، تورکەکان بـەم خێڵە دەڵێن ـ کورد ئـاتمیللی ـ لـە ڕێگە ڕانـە حوشترێکی بێ خاوەنمان بـەرچاو کـەوت ، وتیـان هیچ بـە لاتـانـەوە سەیر نـەبێت کەس لـەم نـاوچەیە نـایەوێت حوشتر بدزێتو حوشتریش ئەوە نیە لە خاوەنەکەی تەرە بێت . یەعقوب پـاشـا لـەگـەڵ شەست سوارێکدا بـە ئـەقـەو دەفو دایەرەو شمشاڵەوە هـەتـا نیـوەی ڕێگا بـە پێشوازیمـانـەوە هاتن ئێمەیش بـەو تـاشو بـەردە سەختەدا بـەرەو ژوور تـاومان دا هەتـا گەیشتین بـەوان وە بـە ئاهەنگو گۆرانی پێشوازییـان لێکردین . خێڵی ئـاتـەمی کورد دوو هەزارو پێنجسـەد خێزانێك دەبن کـە دابەشن بەسەر قەزاکانی :ـ بـەهسینی ، بـازاڕجیك ، بوستان ، ئەوانەی لـە نـاوجەی بەهسینیو بوستان نیشـتەجێن کۆچەری تەواون،هەموو چەند ڕۆژێکی دیکەیە هەوارگەی زستان جێدەهێڵنو بەرەو کوێسـتانو لوتکەی شاخەکان دەکەونە دووی ئاوو لـەوەڕ . خانووبەرەی ئـاتـەمییەکان لـە قـەزای بوستاندا گەلێ قـەشەنگو جوانبوون ، لـە دامێنی چیادا بەریـز دروست کرابوون . لـە هاوینـان دەوارەکانیــان دەپێچنەوەو بەرە لای ئەو کەژو کێوە دەبنو لـە ناو کێج خۆیشیان رزگار دەکـــەن .

هەمو نیشانەیەکی ئاسایی‌و هۆشیاری لە یەعقوب پاشادا بەدی دەکرێت ، بەڵام پەشێوی‌و گۆشەگیری‌ی بە ئاستەم لە روخساریا بەر چاو دەکەوێت ، لەوانەیە ئەو نۆ مانگ گرتنەی بەندیخانەکانی تورکیا ئەو شتانەی تیا دروست کردبێت ، بەڵام هەتا زۆرتر بیناسیت‌و شارەزای ڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی‌بیت زیاتر ڕەوشت بەرزی‌و پاکی ئەوت بۆ دەرئەکەوێت .

ئەو ڕووداوانەی بونەتە هۆی گرتنی یەعقوب پاشا ، خۆی بە درێژی بۆی گێڕاینەوە ، بۆمان دەرکەوت کە تورکەکان وەك سەر خێڵێکی گەورەو دەمڕاست‌و خاوەن دەستەڵات گرتوویانە ، بۆ ئەوە لووتی بشکێنن ، لەگەڵ ٢٠ کەسێك لە عەشرەت‌و خزمی خراونەتە بەندیخانەی مەرعەش بە بیانوی ئەوەی گوایا یارمەتی کۆمەڵێك دزو جەردەی کوردیان داوە ، ئەو ٢٠ کەسە خرانە ژێر ئەشکەنجەو سزای جانەوەرانەوە ، بۆ ئەوەی کۆمەڵێك بەڵگەی درۆو داتاشراو دروست‌بکەن‌و دای سەپێنن بەسەر یەعقوب پاشای داماوا ، نۆ لەو پیاوانە لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان سپاردو هیچیان لێ هەڵنەکران ، یازدە کەسی تریش جیان لێ‌ویستن هەر پێنج نە‌‌یەکەیان بۆ بمانان ، یەعقوب پاشایش ـ نەك بەهۆی ئەم گرتنەیشەوە وەك هەموو سەرۆکە کوردەکانی دیکەی ئەم ناوچەیە گەلێ لە تورکەکان پڕە ، بەبێ پەردە بڵاوی دەکاتەوە کە تورکەکان بە دوژمنی خۆی دادەنێت .

کە گەیشتینە دەوارو هەوارگەی یەعقوب پاشا خوانێکی زۆر قەشەنگ‌و تێروپڕ چاوەڕێی دەکردین ، ١٧ جۆر خواردن لەسەر خوانەکە دانرابوو ، هەموو جۆرێك لەو خواردنانە کرابووە سێ دەفرە ـ قاپ ـ وە، خوانەکە لە دەرەوەی دەوارەکەو لەسەر زەوی کرابوو

بـه ١٧ ڕیز ، هەموو ریزێك ٣ سینی بوو ، تیمەی میوان لەسەر سینی‌یەنی گەورەی مس دانیشتین،خرا بووە سەر نیوە مێزێکی هەژدە ئینچی بەرزەوە، لـە دوای نیو چرکەیەك بۆ ساردبوونەوە دەستکرا بـە خواردن‌و قرتە لـە هەموو خواردنەکان بڕا ، بـا ئەوەش بڵێم کە ئـەم ژەمە چەورو نەرمەی کـە حەڤدە جۆر خواردن‌بوو لـە ماوەی چواردە دەقیقەدا پـاکۆ درا ٠

**لـە سەربانژگەی یەعقوب پاشادا :**

لـەوە دەچوو هاتنی تیمە سۆز وگیانی نـەتـەوایەتی جۆش دابێت ، ئـەوەتـا گیـانی خۆشەویستی‌و هەست بـە کامەرانی ئـاگری سـەندووە، دەهۆڵ‌و زورنـا ئامادە کراوە ، لەسەر ئاوازە ناسـك‌و دێرینەکانی کـورد دەست خۆی کشانە نـاو دەست‌و ئەڵقەیەکی گەورەی هەڵپەرکێ دروست کـرا ، سەماو هەڵپەرکێی ئەتەوەی کورد لـە زۆر لایەنە وە دەشوبهێتـە سـەر سەمای ئیغریقی‌یەکان کە پێی دەوترا (هورا) ، بـە تـایبەتی لەوەدا کـە سەماکەران پـاڵ ئەدەن بـە یەکـەوەو دەست دەخـەنـە نـاو دەستی یەکترو نیوە ئەڵقەیەك دروست دەکـەن ، لەسـەرەتـاوە بـەرەو دوا بـە پێیان دەکەن ، لـە پـاشـا بـە لەشیان ، لەگەڵ ئەو جوڵان‌و هاتو چۆیەشدا تـاوەنـاتـاوێك قریوە ڕووی ئـاسمال دەپێکێت ؟ هەنگاوی سەمای کوردی لـە (هورای) ئەغریقی شێنەیی ترە ، بگرە زۆریش لەیەك جیان ، مـن وەسفی هەڵپەرکێی کوردی ئەتوانم بەمە بکەم کە جولانێکی شەپۆل ئاسای نـاسکی هەموو ئەڵقەکەیە لەسـەر ئـاوازو جولانی هارمۆنێ مۆسیقا ، وەك سروەی بـەیان چۆن گوڵە گەنمەکان دەخاتە سەماو هەڵپەرکێ !

لـەدوای هەڵپەرکێ دەست‌کرا بـە یـاری‌یەکی خۆش کە پێیان دەوەت « تورا » :ـ پیاوێك هەردوو دەستی لەسەر سەری دانـەنـاو بـە قونکـەو « وێرغە » بۆ ماوەی ٣٠ـ٤٠ یاردێك ڕای‌دەکـرد ، لـەدوویدا پـەت یـا

هەولکێك دەگرێتە دەستی سەماکەرێکی دیکە لە دوای چەپڵە دەهێنێتە سەری‌و بە یەکا هەڵدەکوتن ـ سەماکەری دووەمیش هەمان شتی بە دەستەوەیە ئەجوڵێنێ لەو بەزمەدا بەلای ئەوبەری یاریەکەوە شووڵەکە بەرەو ئاسمان فڕێ ئەدا ، خەڵکی‌تریش کە لەو ناوەدا چاوەڕێن بەشداری ئەو سەمان ئەکەن ئەخاتە پەلاماری شووڵەکە ئەدەن‌و هەرکەسێکە گرتیەوە ئەوە هەڵئەبەزێ لەگەڵ ئەوی ترا دێتە کایەوە ، بە شێوەیەکی تاکوتایکی ئەمیش دەبەخشێ‌و بەرەودوا لە سەماکان ڕا دەکات ، هەر موو دەستی دەخاتەوە سەر سەری‌و ئەڕواتەوە بەرەو ئاوازە مۆسیقا تایبەتی‌یەکە ، لەو یاری‌یە کۆنانە چەند کاتژمێرێکی خایاند ، خۆشی‌و ئاهەنگێکی گەرمی وروژان ، پیاوانی پەنجا سپی ٧٠ـ٨٠ ساڵە ئازایانە بەشداری‌یان تیا دەکرد ، جێگەی گومانە ئەو لێدانانە کە لە یاری‌یەکاندا ڕوو ئەدەن بەسەرهاتی‌بن ، جێگەی سەرنجە ئەوانەی لەگەڵ یەکدی دەچوونە کایەوە حەریفی‌و هاو تەمەنی خۆیان هەڵئەبژارد .
لەپاش نیوەڕۆ بەرەو (مالاتیا)[٣٤] کەوتینە ڕێ ، شەو لە دێی (مرگانا) لاماندا ئەم دێیە ٤٠ ماڵێك ئەبێت ، دانیشتوانی کوردن‌و لە هۆزی (ئاکەمی)ین ، بەم شێوەیە جارێکی‌تر بووینەوە بە میوانی ڕۆڵەکانی ئەم عەشرەتە .

دوای شێوان ئاگر تێڵەدراو لە دەرەوە دەستکرا بە یاری « سینگاسینگ » واتا سنگ بە سنگ :ـ

٢٠ یاردێك دوور لە ئاگرەکە ئەلقەیەکی گەورە دروست ئەکەن ، یەکێك لە ئەلقەکە دەرئەچێ‌و نزیك ئاگرەکە دائەنیشێ ، لە هەموو لایەکی ئەلقەکەوە هێرشی ئەبرێتە سەر ئیدی ئەولای تێڵەی ئاگرەو ئەملای زڵلەو پشتەملەیە ، ناهێڵێت ـ ئەلقەکە بشکێت !!

# [ ـ١ـی ئـەیلول ]

ئـەمڕۆڕوەو « پـالوت » کەوتینـە ڕێو ٢١ میـلێکمـان بڕیو بـە بـەرزاییەکانی «کورتەجامدا تێپەڕین کە شەش هەزار پێیەك لـە دەریاوە بەرزە » دەشتی پـالوت هەرچـەندە بچووکـە ، بـەڵام بـە بـاشـی ئـاو ئەدرێتو زۆریش بـە پیتە ، مەرکەزی نـاحیەی ئـەم نـاوچەیش هەمان نـاوی هەیەو (١١) دێیەکە ، نۆ دێیان کوردنو دوانەکەی تریش تورك ، ئەم نـاوچەیە بـە پەڵـك « سورە چنـال »ی بـەرزو هەڵچو داپۆشـراوە ، لـە هەموو لایەکی تریشەوە گەمارۆ دراوە بـە تـەلان تـەلانی سروشتی کە بە شاخێکی قـاوەبناوی ڕووتو تـووتـا هەڵـدەگیرێن ، بـە راسـتی ئـەم نـاوچەیە دیمەنێکی فـارسییانەی(د٣) هەیە !!

بـەرگی چوارەمی ئەو ڕاپۆرتەی کە وەزارەتی جەنگ دەری کردووە ، لـە بـاسی نـاوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچوکدا « پـالوتیش » بـاس دەکـات کە ٢٢٠ ماڵێـکەو دانیشتوانی کوردی «میلالی»ین ، جگە لە چەند تورکێکی ڕەسەنی بـە سالاچووی سـادە نـەبێـت ، وەك دەڵێن بـەر لـە جەنگ (٤٠٠) مال بووە ، بـەڵام دوای جـەنگ تـەنهـا ـ ٢٠٠ مـاڵێـکی مـاوەتـەوە ، یەکێك لـە ئەنجامەکانی جەنگ ئەمەیە کە تەنها ئەم دێیە سـەد بێـوەژنو منـاڵـی هەتیوی تێدایە ، ٧٠٠ گەنجی بووە بـە سەرباز و خۆی پێشکەش دەوڵەتی تورکیا کردووە ، کە هەتـا ئەم کاتەش تەنها (٥٠) سەرباز لەوان گەڕاونەتەوە ئەم دێیە ، ئەمانەش کە گەڕاونەتەوە بریندارو قـاچو دەست شکاوو پـەریوتو شەکەتن .

گریمان ژمارەی دانیشتوانی ئەم شـارە لـە پێش جەنگدا دوو هەزار کەس بووبێت ، وە ڕۆڵـەکانی کە کرابن بـە سـەربـاز ٣٥ کەس بووبن ،

ڕێژەکەی دەکاتە (١٥٪) وە لە چاو ولاتەکانی ئەورووپادا ڕێژەیەکی بەرزو قەبەیە ، هەر چۆنێك بێت قەبلاندنی هەموو ماڵێك لە پێش جەنگدا بە (٥) کەس قەبلاندنێکی وردو ڕاست نی یە ، چونکە ئەم ژمارەیە بەپێی عەشرەت و خێڵەکان ئەگۆڕێ بۆ نمونە :ـ دێیەکی نیشتەجێ و خانووبەرە باش بەلای کەمەوە ژمارەی خێزانی ٦ تا ٧ کەسێك دەبێ ٠ ژمارەی ئەو هێش و گامنانە کە ٤ گا ڕایدەکێشن لە (١١٣٠)وە دابەزیوە بۆ (٧٠) ، ئەم دابەزینە دەشوبهێتە ڕادەی کەمبوونەوەی دانیشتووەکان ، سەرەڕای بەسەرهاتە دژوارەکانی جەنگ دانیشتوانی ئەم دێیە ژیانیان زۆر لێ نەشێواوە ، جیاوازی یەکی وەهایان نەکردووە لە کاتی جەنگدا ، لەوانەیە ئەم دێیە لەمەوپێش بەسەمەنەو زەخیرەیەکی باشی گەنم و جۆیان قایمە کردبێت ، بۆیەکا گرانی هیچ کاری تێ نەکردوون ، لە کاتێکدا گەنم لە هەموو پێویستیەکانی تری ژیان گرانترە لێم نەبیستوون هیچ کەسی ئەم دێیە لە برسێتیە ترسناکەکەی ساڵی ١٩١٧ـ١٩١٨دا لە برسا مردبێت ٠

لەو ماوەیەدا بە قوڵی لەوە گەیشتم کە هەلسوکەوت و ڕەوشتی تورکەکان زۆر جیاوازن لەگەڵ کوردەکاندا ، ئەوەی سەرنجی راکێشام ، تورکەکان دەنگ و مۆتن ، مرۆڤ کە دەیان بینێت هەست بە پەستی دەکات ، بەلام کوردەکان ڕووخۆش و زرنگ و ئەازان و زوویش هەڵئەچن ، هەستی نەتەوایەتی یان قووڵترو تیژترە لە تورکەکان ٠

ئەم بەیانیە لە ڕێگا پیرەمێردێکی تورکی ئەحمەد ناومان تووش هات ، ئەوەی دەزانی کە من ئەفسەرێکی ئینگلیزی یەم و بە پەلە ئەم پرسیارەی ئاراستە کردم :ـ ن

کەی ئینگلیزەکان یەنە ئەم ولاتەو دادو هەمو شتێك دەگێڕنەوە سەر

دۆخی ڕاستی خۆی ؟!

ئـەم پرسیارەش لە لایەن یەکێ لـە خانەدانەکانی پـالوت لـە کاتی نـانخواردنـا ئاڕاستەم کرا :ـ ئێمە هیچ دەربەست نین هێزو دەسـەڵاتی ئەوروپـایەکان ئیشوکاری ئەم ووڵاتە بگرنە ژێر دەستی خۆیان ، بـەڵام لەوە نیگەرانین کە دەوڵەتی ئەرمەنی‌یەکان بێتەکایەوە ، وە ئێمە هـەرگیز سەرشۆڕ نـاکەین بۆ ئەو دەوڵـەتە ئەرمەنی‌یەی کە دەوڵـەتە گەورەکان دەیانەوێت لەم ولاتەدا ڕاستی بکەنەوە ، بـەڵام زۆربـەی کوردەکـان بـە جۆرێکی دیکە تـەمـاشای مـەسـەلـەکـان دەکـەن ، ئـەوان زۆر بـە پـەرۆشـەوەن خۆیان لـە چنگ دەسـەڵاتی ڕزیوی تورکەکان دەربـاز بکەن‌و دەوڵەتێکی سەربەخۆ بنیات بنێن ، داکۆکی‌و ململانی کوردەکان لەو زەمینەوە هەڵقولاوە کە شەخسیەتی تایبەتی‌و ڕەسنی کوردەکان خۆی لـە خۆیـا شـەیداو سـوتـاوی ئازادی‌یـە ، سەرنەوی نـاکـات بـۆ هیـچ سەرکوت‌کردن‌و داگیرکردنێك ، لـەبـەر ئەو هۆیانە دەسەڵاتی ئینتیدابی سەر بە ئێمە ڕێگایەکی سەخت‌و دڕکاوی لەبەردەمایە ، پێویستە مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ کوردەکانا بکات ، بە پێچـەوانـەوە دەسـەڵاتی ئینتیـدابی ئێمـە تووشی هیچ جۆرە جورتمێك نـابێت لەگەڵ دێ‌نشینی‌و خـاوەن موڵـکە بچوکەکانی تورك‌دا[٣٦] ئەوانە چەند بەڵگەو نمونەیەکی تۆکمەی تـرن‌و بۆمانی دەسەلێنن کـە شەخسیەتی کوردو تورك لەبنەڕەتەوە زۆر جیاوازن ، بۆ نمونە :ـ دابو ڕەوشتی میـوان‌داری[٣٧] لـە دێ‌کـەی یـەعقوب پـاشـادا چۆن بوو ، دیمان بـە چ جۆرێـك کوردەکان لـە قـەدرزانـین‌و پێشوازی‌دا نوقمیان کردین‌و ئێستەش لەم دێیـەداو لـە مالـی خاوەن مولـکی گەورەدا چۆنە ؟!

دوێنێ کە گەیشتینە دێی کوردەکان ، چـارەوێ‌کانمان بـە جوو

ئالیکیکی زۆر مڕ کران ۰ بەڵام لەم دێ بە بە پەرۆشەوە پرسیاری ئەوە دەکەن کە چەند وڵاخمان پێ یە ؟

ئەو بەیانیەی لە دێی کوردەکان دەرچووین خوانێکی ناشتای تێرو تەسەلیان بۆ ئامادە کردین کە لە (١٠) جۆر خواردن پێکهاتبوو، تەنانەت بە بۆنەی ئەو خوانەشەوە چەند کاژێرێك دواکەوتین ، بەڵام لە دێی تورکەکاندا تووشی چەند پرسیارێکی هیچوپووچ هاتین ، بۆ نمونە :ــ هەر لە شەودا پرسی ئەوەیان لێ دەکردین کە ئایا بەیانی زوو دەرئەچین یا دێر ؟ دیارە بۆ ئەوەی ئەرکی نانخواردنێکی بەیانی نەکەوێتە سەریان !!

* * *

لە « پالوت »یشدا وەك عینتابو بازارجیك ۰ هەمان قەوانو بێزاری درایەوە بە گوێماندا کە لەو ناوەدا جەردەی کوردەکان دەگەڕێنو چالاکی ئەنجام ئەدەن ۰ بازرگانە قەبەکانی تورك لەم شارەدا هەمیشە گلەیی لەوە دەکەی کە ڕێگای کاروان لە بەرعشەوە جێی متمانە نی یە ۰ مەبەستیشیان لەوەیە کە لایەن جەردە کوردەکانەوە پەلامار ئەدرێنو هەمیشەیش کاروانی تورکەکان دەبوون بە پارووی چەوری ئەو جەردانە !!

بەو هۆیەوە ئەو بازرگانانە پەنا دەبەنە بەر هەمو ڕێگەیەك بۆ ئەوەی خۆیان لەگەڵ ئەو جەردانە بچەسپێننو بگرە گەلێ جاریش دەبوونە هاوبەشو شەریکی ئەوان ۰۰۰ تەنها بۆ ئەوەی کاروانەکانیان بێ ترس بنو چەپاو نەکرێن ۰

دێنشینەکان بۆیان باس کردم کە چەند پارچە زەوی یەکی بچووك

دەکەن بە توتن ، بەڵام ... خۆیان دەکەن ... دەکەن لە خۆیان دەمێنێتەوە ، چونکە یاسای ... وەرگرتن ـ ی توتن ساختەو پڕو پووچە بە تایبەتی کاربەدەستان و ... ئەو یاسایە ، بۆیان بەس دەکردین کە مووچە خۆرە کان ... (٣٨) بۆ جاری یەکەم واتا لە پێش هەڵگرتنی بەرهەمدا دێنە لادێکان و تەماشایەکی پارچە توتنەکان ... دەست دەکەن بە ... تۆزەشە لە جوتیارە سادەکان ، بەوە ... ترسێنن کە لە کاتی وەرگرتنی توتندا زۆربەی بەرهەمەکانیان بە چرووك و بێکەڵك ئەدەنە قەڵەم ... ئیدی ئەوەی گیرفانی گەرمە ... فەرمایشتانە دەکاو زوو بەزوو سەری خۆی دەقەبڵێنێت .. ئەوەش ... ئەبێ ئامادە بێت بۆ دزیو چەپو گوپی ئەم جرو جانەوەرانە ، بۆ جاری دووەم ئەو مووچە خۆرانە تەشریف دەهێننەوە ناوچەکەو ئەوەی سەری نەقەبڵاندووە بەشێکی زۆری تورتنەکەی چرووك دەکەن ، دیارە ئەم بەشە چرووك کراوە ناسوتێنرێت بەڵکو دەبێتە پارویەکی چەوری بێمووی ئەو دزو ساختەچی یانە !!

ئەگەر توتنەوانی ئازاد بوایە ـ وەك لادێیەکان ئەیانووت ـ بەرهەمو داهات چەند جار لە ئێستا زۆرتر دەبوو ، لەم شارەدا کێشەی پارە گۆڕینەوە زۆر ئاڵۆزە .. لیرەیەکی ئالتوون نرخێکی هەمیشەیی نیە ، ئەوەتە لە حەلەبدا نرخی $8\frac{1}{4}$ مەجیدی یە ، وە $8\frac{1}{2}$ مەجیدی یە لە عینتاب ، $7\frac{1}{2}$ مەجیدی یە لەزارجیك ، ٧ مەجیدی یە لەم شارەدا ، گۆڕینەوەی مەجیدی بە قروش هەمان ئاڵۆزی تووش هاتووە ، یەك مەجیدی بە ٢٥ قروشە لە عینتاب ، وە (٢٣) قروشە لە بازارجیك ، وە لێرە تەنها ٢٠ قروشە . پارەی ( مەعدەنی ) ـ ماتەری ـ لە حوزەیرانی پارەوە ( واتە حوزەیرانی ١٩١٩ ـ وەرگێڕ ) لە بازاڕدا توخمی نەماوە و بەکار

ناهێنرێت ، مەجیدی کۆنیش بە مەرجێك وەردەگیرێت لە ٢٠٪ی نرخەکەی لێ دەشکێت • لیرەی کاغەزیش ٢٠ مەجیدی نرخی کەمترە ، هەرچەند هەفتەیەك لەمەوبەر نرخی سەرکەوتوو گەیشتە ٢½ مەجیدی • هۆی بەرزیو نزمی نرخی پارە ئەوەیەکە دەوڵەت قەرزەکانی خۆی بە پارەی کاغەزئە داتەوە • لە کاتێکدا ئەگەر بە شتومەك بیدایەوە نرخی پارەی کاغەز دائەبەزیو ئەگەیە نیوەی تیمتاو بگرە چواریەکیش •

## [ ـ٢ـی ئەیلول ]

ئەمرۆ گەشتێکی کورتمان بۆ دێی « توریم » کرد خێمەگای عومەر ئاغای سەرخێڵی «کورجیکی»ی لەم دێیەدایە • ئەو خێڵە کوردە لەو هۆزانەن کە نیشتەجێنو لەو هاوینەاندا ماڵەکانیان لەدێ دەرئەچنو دەچنە لەوەڕگاکان • ئەوەی هەیەتی دەواری ڕەشی (کون)ی لێ هەڵئەدا ، لە ٣٠٪ خێزانەکانی ئەم خێڵە هەژارو کەم دەسن ، ناتوانن دەوار هەڵدەن • ناچار دەبن لەلقوپۆپی درەختە گەورەکان کەپر دروست بکەن ، ئەم خێڵە ٣٨ گوندێك دەبن ، (٢٥٢٠) خێزان لەو گوندانەدا دەژین • ٤٩٥ خێزانی تورکیش لە ناویانەدا دەژین ، ٣ـ٤ گەورەی دێ هەیە کە دەکەونە پێدەشتو نزیك لەڕێی گشتیەوە، دانیشتوانی ئەو گەورە دێیانە پەیوەندیان بە کاربەدەستانی دەوڵەتەوە پتەوترەو بە تورکی ئەدوێن • ئەوانەی کە پلەیەکی خوێندنیان بڕیوە تورکی لە زمانی زکماکی خۆیان باشتر دەزانن • کە ئێمە سەرزەنشتمان کردن چۆن زمانی خۆیان لەیاد ئەکەن ! تۆزێك پەست بوونو وتیان :ـ ئەگەر زمانی تورکی بە باشی نەزانین هەرگیز

ناتوانین ڕوو بکەنیە دەراگاکانی میریو بینە مووچەخۆر ، زۆربەی دیهاتی کوردیك بەکوردی ڕەوان ئەدوێن ، جگە لە هەندێك پیری بە ساڵاچوو نەبێت کە زمانی تورکیش بە بماشی دەزانن‌و پێی ئەدوێن .

لەناو ئەم هۆزەدا بە زەقی هەست بەوە دەکەیت کە حوکومەتی تورکیایان خۆش ناوێت‌و بگرە ئەمشی بوغزێنن ، چونکە ئەو دەوڵەتە بێ هەزاری لێ ڕەشبگیر کردوون‌و کێشی کردونەتە کوڕەکانی جەنگەوە . هەزار کەسێك نەوەبە [illegible] پاش ماوەیەکی کەم هەڵهاتوون‌و قاچاخ بوون . بە [illegible] ئەو فەرمانەی کە ئەنوەر پاشا[٣٩] دەری کرد خانوو بەرەی ئەو هە[illegible] سەربازە سوتێنراو لە پاش ئەم ناوانە نامەردانەیە هەموو ماڵو سامانیان چەپاوو تالآن کران ، بە هۆی ئەو تاوانەوە خێزانەکانیان کەوتنە بەردەم کەڵبەو کاجێڕی جانەوەر[illegible] [illegible]ێتیو دیسان ئاوارە بوونەوە ، پرسیمان ئایا ئەو سەربازانەی ؟ [illegible]ڵیان سووتاو چەپاو کران‌و خێزانیان تەروەنە بە[illegible] [illegible]رێچیو راپەرینێکیان هەڵنەگیرساند ؟! ووتیان :ــ بە پێچەوانەی خێڵەکانی نرەوەو بۆ نەگبەتیو نامەیی فزەیان لێوە نەهات‌و لەو باوەڕەیشدا بوون کە هیچیان بەرامبەر ناکرێت تەنها ئەوە نەبێت کە بە پەڕۆ دەگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی دوور ، بەلام سزاو تۆڵەی ئەوان هیچ لەو خێلانە کەمتر نەبوو کە مەردانە لە ڕووی ستەم‌و زۆرداریدا ئالای شۆرش‌و ململانیان هەڵگرد ، بیست ساڵێکیش لەمەوبەر رۆڵەکانی ئەم عەشرەتە دەستیان دایەوە سەرپێچیو ململانێکی تیژو بەربلاو لە ڕووی دەوڵەتی تورکیادا ، ئەو ڕاپەرینەش بە شیوەیەکی جانەوەرانە بە پێی نەریت‌و پیشەی تورکان سەرکوت کراو لە خوێنا گەوزێنرا مسەرەڕای ئەوەش دەوڵەتی تورکیا لە سزای ئەم ڕاپەڕینەدا باجی

لەسەر بەرزکردنەوە ، لە ١٠٪ەوە کرا بە لە ٢٥٪ ، ئەم بریارە ئەوە دەگەیەنێت کە تەنانەت ئەو جوتیارەی کە خاوەنی تۆو جوتەگای خۆیشی نیەو بەکرێ کار دەکات ، ٧٥٪ی بەرهەمی خۆی بدات بە جەنابی دەوڵەت‌و خۆی بە ٢٥٪ی بژێ !!

ئەو کردەوە بێ بەزەییانەی کە دەوڵەت دەیکرد بەرامبەر ئەم جوتیارانە بەم بیانووە بووە گوایا زەوی ئەم ناوچانە بە فەرمانێکی سوڵتان خراونەتە سەر زەوییەکانی سوڵتان عبدالحمیدو[٤٠] بونەتە موڵکە تایبەتی‌یەکانی جەنابی !! شتێکی تریش هەیە بوەتە بنەمای قین‌و رقی ئەمانە لە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی کە هەمیشە دەوڵەت هەڵپەیەتی بۆ کۆکردنەوەی ئازروقەو خواردەمەنی‌و ئاژەل ، بەتایبەتی لە کاتی جەنگدا هەموو بەکێکی خەڵکی ئەم گوندە نزیکەی ٢١ پاوەندی بەلای دەوڵەتەوە هەیە ، بەش کردنەوەیەکی سەرژمێری سادەو لەسەر بناخەی پێشوو دەوڵەت چەند ملوێنێك قەرزاری ئەم ناوچەیەیە ، لە هەمووی سەیرو سەمەرە تر ئەمەیە ئەو حوکومەتە داتاشراوەی کە ئێمە دەمانەوێت بنیاتی بنێین بۆ تورکیا ئایا دەچێتە ژێر ئەم داری شکێنەیەو دانەوەی ئەو قەرزانە دەکات بە بەرتیلی ئارام ئاسایشێکی هەمیشەیی ؟!

عومەر ئاغایش گلەیی لە بەختی خۆی دەکرد ، چونکە لە کاتی جەنگدا زۆربەی دەسەڵات‌و دەمراستی‌یەکانی لە کیس چووە ، ئێستا هەموو ئەو دەسەڵاتانە خراونەتە ئەستۆی بەرێوەبەر ، هەمیشە ئەم سیاسەتە بەشێك بووە لە نەخشەی تورکان ، هەرچەند کات کاتی جەنگەو ئەو هەموو خەڵکە راپێچ دەکرێتە کۆری جەنگ‌و کوشتار ، لەگەڵ ئەمەشدا دەوڵەت دەستێکی بالای هەیە لە ئاژاوەو

دووبەرەکی نـانـەوە لـە نێوان عەشایەرو خێڵەکاندا بـە ڕادەیەك دەولەت لەکاتی ئاسایشدا ئەو پرکێشیەی لێ نەدەهات بۆ نمونە : لەپێش جـەنگدا دەوڵـەت لەگەڵ خێڵۆ عەشایەرەکاندا خۆی دەگونجاند ، تەنـانەت ناحیەو قەزاکانیش بـەنـاوی عەشایەرو خێڵەکانەوە نـاو ئەنران ، بەڵام لە کاتی جەنگدا سەرەڕای باری نـائـاسایی نـاوچەکەش دەوڵەتی عوسمانی دەستی کردەوە بـە ڕێکخستنی ئیش‌و کاری خۆی ، وە بە شێوەیەکیش کـــە عەشایەرەکانێ پـارچـە پـارچەو لاواز بکات وە خۆیشی بـە هێز بکـات ، هەر لەو کاتەدا بوو یازدە دێی ناحیەی بازارجیك کران بـە سەربەشـی ناحیەکانی تر ، وە چەند دێیەکی تریش خرانـــە سەر قەزای بوستانێ دراوسـێی •

یاسای موڵـکایەتی زەوی لەم ناوچەیەدا بەم شـێوانـەی خـوارەوە ئەنجام ئـەدرا :ــ

١ ــ یاسای بەکرێدان یاخۆ ڕۆبا : Ruba ( لـــە ــ ربع ــ چواریەك ــ ی عەرەبیەوە هاتووە ــ وەرگیر ) : کرێچی بە پێی ئـەم یاسایە تۆو ئامادە دەکاو زەوی بە گای خۆی دەکێڵێت‌و خـاوەن زەویشـ چواریەکی بەرهەم بۆ خۆی دەماشێتەوە •

٢ ــ یاسای نیوەکاری Nivikav :ــ

کرێچی بـە گای خۆی زەوی دەکێڵێ‌و ئـامـادەی دەکات‌و خاوەن زەویش تۆو ، لەسەر خەرمانیش بەرهەم بە نیوەیی بەش دەکرێت !! •

٣ ــ مـورابـا Muraba :ــ تۆو ، کێلانی زەوی ، لـەسەر خاوەن موڵـکەو تەنهـا سێیەکی بەرهەمیش ئەدرێت بە جوتیار ، ئـەوی تریش دەچێتە گیرفانی خاوەن موڵـکەوە •

# [ ـ٣ـی ئـەیلول ]

لـە ڕێکەماندا بەرەو [ ملاتیا ] تووشی چەند کۆمەڵو گرۆیەك هاتین کە لە قارس‌ەوە[٤١] ڕایان کردبوو وە پەنایان بۆ ئەم ناوچەیە دەهێنا،چونکە تورکەکان لـە قارس پاشەکشەیان کردبوو ، وە ئەرمەنەکان لەوێ دەزگاو دەوڵەتیان تیـا دانـابوو ، کە لێمان دەپرسین ئایا بیر لەوە دەکەنەوە کـە بگەڕێنەوە خاكو ئاوی خۆیان ؟ ئەوانیش بە درێژی چیرۆکی جانەوەری‌و کوشت‌وبڕی دەوڵەتی[٤٢] ئەرمەنیەکانیان بۆ دەگێڕاینـەوە کـە دژ بـە موسڵمانەکان ئـەنجامیان دابـوو ، مردنیـان بە ئاوات دەخـواست نـەك بگەڕێنـەوە سەر خاكو ئاوی خۆیان‌و لەژێر چەپۆکی دەوڵەتی خوێن‌ڕێژی ئەرمەنی‌دا بژین !! بەداخەوە ئەو پەنا هێنەرانە ئەڵهـای [ خۆزگەی ] ئـەو ڕۆژانەیان بوو کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕووسەکاندا[٤٣] دەژیـان چونکـە کەس دەستی نەدەخستە ئیشوکاریان‌و سوکترین باجیان ئـەداو لـە هەموو شتێك باشتر بەلایانەوە ئەوەبوو کە ڕووسەکان لە خزمەتی سـەربـازی قوتاریان کردبوون ، کە گەیشتنە قـەراخ شـاری مـلاتیـا پـارێزگـارو سەرۆکی شارەوانی‌و ماقولانی نـاوچەکە هاتنە پێشوازی‌مان ، خەلیل بەگی پارێزگار یەکێك بوو لە بەدرخانی‌یەکان‌و مامەی ئەو بەدرخانیانە[٤٤] بوو کە لەگەڵ من هاتبوون ، خەلیل بەگ کورد پەروەرێکی ئازاو سەنگین بو ، لە کاتی خۆیدا یانەی[٤٥] کوردی‌و ڕۆژنـامـەیەکی[٤٦] سـیاسی لـە ئەستەموول دامەزراند ، هەتا بڵێی پیاوێکی دووربین‌و ئاغرو سەنگین بوو ، بـە ئومێدو ڕوناکبینی لە ئینگلیزەکان گـەیشتبو [ ڕۆشنبیرانی کـوردو عەرەب‌و هەموو گەلانی ژێردەستی داگیرکەری چـەپەڵی عوسـمانی بـە خۆشنودیەوە تەماشای ئینگلیزو هاوپەیمانەکانیان ئەکرد ، هیوایان وەهـا

بوو کە ئەو هێزانە هاتوون بۆ رزگارکردنیان لە چنگی خوێناوی تورک،
بەڵام بەداخەوە هەموو ئەو رۆشنبیرانە دڵشکست بوون ، چونکە لە دوای
جەنگ هەموو ئەو هێزانە کەوتە هەڵپەو دانەجیرە لە سەر کەلاک و
موڵکەکانی پیاوە نەخۆشەکە ، رزگاریان بوو لە چنگی داگیر کەرێکی
دەبەنگ و بوودەڵە ، کەوتنەوە ژێر چەپۆکی داگیر کەرێکی زاناو فێڵبازو
عەسری !! . خەلیل بەگ لەلای دەستەی فریاەی « هیئة الاغاثة »ی
ئەمەریکی زۆر رێزی لێ دەگیراو متمانەی پێ دەکرد ، ئەرمەنییەکانی
مالاتیاەش زۆریان خۆش دەویست ، لە هەمان کاتیشدا گلەیان لێ بوو،
چونکە بەرای ئەوان هەرچەندە تورکەکانیشی نەدەویست ، بەلام دژی
تورکە رەگەز پەرستەکانی ناوچەکە یارمەتی ئەرمەنیەکانیشی نەئەدا .

هەرچەندە تورکەکانیش خۆیان هەڵئەقورتانە ئیش و کاری دەوڵەتەوە ،
لێرەدا پرسیارێکی چەتوون بە پەرۆشەوە یەخەمان دەگرێ و ئەڵێ : خەلیل
بەگ یەکێکە لە بنەماڵەی بەدرخانییەکان کە بە شۆرەتن لە تێکۆشان و
قوربانی دانا بۆ نەتەوەی کورد ، ئیدی چۆن کراوە بە پارێزگای ئەم
ناوچەیەو ئەم کارە ناسکەیان پێ سپاردووە ؟ لە کاتێکدا تورکەکان
تووشی گەلێك کێشەو دەردی سەری بوون بە دەست ئەم پیاوەوە ، چونکە
لە کرۆکدا دژی هەموو دەستەلاتێکی تورکان بوو لەم ناوچەیەدا کە
زۆربەی دانیشتوانی کوردن !! کە تۆزێك قووڵ دەبینەوە بۆ ئەم مەسەلەیە
وەلامی ئەو پرسیارەمان دێتە دەست :ـ موستەفای عارف پاشای وەزیری
ناو خۆی تورکیا ، دۆستی دێرینی خەلیل بەگ و خێزانی بەدرخانییەکانەو
پشتی بتەوی خەلیل بەگی پارێزگارە ، بەلام ئێستا موستەفا پاشاییش لە
وەزارەتا نەماوە دەوڵەتی تورکیاش بە چاوی باشە تەماشای خەلیل ئاغاو

دووربینیش دەکلات لـە لابردنیا ، چونکە دەسەلات‌و ڕێزێکی زۆری هـەیە لـەنـاو ڕۆڵـەی نەتەوەکەیـا ، تۆزێکیش هۆی ئەوەیە کە ئیداری‌یەکی بـەزاخەو ئیشوکاری نـاوچەکـە بە بـاشی ئـەنجام ئـەدات‌و لەنگەری ئاسایشی نـاوچەکەیە ، وە لەو ئاقارەدا لـە پارێزگارێکی تورك گـەلـێك بـاشترو بـە ئەمەك ترە خەلیل بەگی پارێزگـار ئـەمەی گەیانـدووە بـە دەستەی فریای ئەمەریکا لە ڕۆژهـەلاتی نـزیکـدا ( الشـرق الادنـی ـ وەرگێڕەران ـ ) کە ئەگەر بێت‌و جەنگ‌و دوژمنایەتی لە نێوان تورکیـاو هاوپـەیمانەکاندا ڕوو بدات ئەوا کوردەکانی نـاوچەی ملاتیا دەست ئەدەنە شۆڕش‌و تورکەکان لـە ناوچەکە دەرئەکەن ، ئەو گفت‌و قسانەی خەلیـل بەگیش بە ڕێگە یەك لە ڕێگەکان کەوتەوە بەرگوێی کاربەدەستی گشتی‌ی ئەمەریکا لـە ئەستەموول • لـە گەڕانەوەمدا بۆ ئەستەموول چوومـە لای وەزیری ناوخۆ ڕێ‌ی ئەوەی دام کە بروسکەکانی خۆم بە پـەلـە بنێرم ، کە هاتمەوە ئێرە ـ ملاتیا ـ چەند بروسکەیەکم بـۆ هاتبو ، بەلام دەقەکانی کلکـو گوێ کرابوون ، بەو نیازەی تەم‌و مژبێت‌و چەواشەم بکات ، لەبەر ئەوە چوومە لای بەڕێوەبەری بروسکە ( لـە دوایـیدا بـۆم دەرکـەوت کـوردە ) وە لە شەودا بـە یارمەتی ئەو توانیم ڕاستەوخۆ پەیوەندی بکەم لەگەل (ئورفا)[47] داو بە وردی دەقی بروسکەکان ڕاست بکەمەوە •

## [ ـ٤ـی ئـەیلول ]

ئەمڕۆ هەوالم زانی کە والی خەربوت فەرمانی بە قائممقامی «کیاختە»ی کوردنشین داوە کە ڕێگەی ئەوەم نەدات گەورە پیاوانی ئەم ناوچەیە ببینم ، « دەستەی فریای » ئەمەریکا لە ڕۆژهەلاتی نزیکدا دوو کچن ، ئـەوەیان بـە ئێمە ڕاگەیاند کە هیوادارن یارمەتی‌یەکی مرۆڤـایـەتی لێ‌قـەوماوان

بەدەن بەبێ گوێدانە جیاوازیی نەتەوەو ئاینو ڕەگەزو ڕەچەڵەك ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەو دەستەی فریایە بۆی باس کردین کە ئەرمەنی یەکان لەم بارەیەوە هەڵوێستێکی ئالۆزیان هەیە ، تەنانەت زۆر بەگران دەتوانین منالێکی هەتیو بخەینە هەتیو خانە !! ئەو دەستەیە بۆی باس کردین کە کچە مامۆستایەکی ئەرمەنی هەمیشە مێشكو بیری قوتابیەکانی بە گیانی دوژمنایەتی موسڵمانەکان ئاو ئەدات ، ئامادەیان دەکات کە هەمیشە چاویان لەو ڕۆژە بێت کوشتارو قەسابخانە دابنرێت بۆ موسڵمانەکان لە تۆڵەی هەمان کوشتاری[48] موسڵمانەکان بەرامبەر ئەرمەنیەکان .

ئەمڕۆ بروسکەیەکی دوورو درێژم ناردە ، پوختەی هەڵوێستی سیاسی گشت کوردەکانم تیا ڕوون کردەوە ، پوختەی ئەو بروسکەیەم سەبارەت گەشتی عینتابو ملاتیا بوو ، ئەمڕۆ گەیشتمەوە مالاتیا پاش ئەوەی ۲۰۰ میلێکی شاخو داخم بە عینتابەوە بڕی ، ئەو ناوچەیە ئەرمەنیەکان داوای دەکەن لە کاتێکدا بەر لە جەنگ تەنها ۲۵ خێزانی ئەرمەنی لەم ناوچەیەدا ژیاوەو خەریکی پیشەسازی بوون ، لەو ۲۵ خێزانەش کەمێکی ماوەو خۆیان قوتار کردووە لە کوشتوبڕ .

ئەو ئەرمەنیانەی کە لە کوشتار خۆیان ڕزگار کردووە بە ڕاستی بێ پەردە باسی ئەوە دەکەن کە کوردەکان هەڵوێستێکی پڕ جوامێریو شەرفمەندانەیان بووە لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا ، لە کاتێکدا ئەوان ڕاکردوو پەناهێندە بوون هەتا ئەو کاتەی کە لە کوردستاندا ژیابن ، سەخێرایی پێداویستیو حەشارگەیان بۆ ئامادە کردوون .

لە عینتابەوە جگە لە سی‌ی تا چل میلی یەکەم نەبێت کوردەکان لە

٧٠٪ تـا ٨٠٪ی دانیشتوانی گشتی‌ی نـاوچەکەن ٠٠

بـە وردی لـەوە گەشتووم کـە خـەڵکی ئـەو نـاوچانـەی پێ‌یـا ڕۆیشتووم هەست‌و گیانێکی قووڵی نەتەوایەتی‌یان هەیە ، [illegible] یـەت ئـەو سـۆزی کوردایەتی‌یە لـە گەشەبوون‌و پوختە بوون‌دایە ، لـە هەمان کاتیشـدا ڕقیان لـە تورک‌و حوکومەتەکـەیەتی‌و پـڕن لێی ، تۆزێك سەرنج بدەیتە بـارو گوزەرانی خـەڵکەکـە هـەست دەکـەیت کـە بـە پـەرۆشەوە ئامادەن شۆڕشێکی توندو تیژ دژی دەوڵـەتی عوسمانی بەرپـا بکەن ، بەڵام ئـەو ئـاواتە بە شێوەیەکی کاتی کپ کراوە ، چونکە خێڵ‌و عەشرەتەکان لە کاتی جەنگدا بە تەواوی تۆقێنراون‌و زارە ترەك بوون ، بـەڵام هەڵـگیرسانی ئـەو شۆڕشەیش تیرەو دەستێوەردانـــی دەرەوەی پێویست نی‌یە ، هاکا مەشخەڵانی کردوو بوژانەوەی بـەربڵاوی نەتەوەی کورد ئەو کاتە دەست پێ‌دەکات .

من لەم نـاوچانەدا هەتـا ئێستەیش هەستم بـە جووڵانـەوەی دژ بـە ئینگلیز یـا ئیسلامچێتی [ کە لـە ڕۆژهەڵاتی ، ماریکردا تۆزێك چالاك بوو] نەکردووە ، بە پێچەوانەوە لـە هەر جێگایەك [illegible] ی پـڕ لـە خۆشەویستی‌و ڕێزەوە پێشوازی‌مان لێ‌کراوە ئێستەیش کێشـــــە گرنگەکانی ئەم ناوچەیە ئەتوانین بەم شێوە پوختەی خوارەوەباس بکەین :ـ

أ ـ بۆ کێشەی ڕەگەزی‌و نەتەوەیی لەپێش جـەنگدا هیچ بـاس‌و خواسێکی نەبوو ، چونکە دانیشتووە ئەرمەنی‌یەکان کەم بـوون ، کاتێـك کەڵـکەڵەی دەوڵەت‌داری‌یان کەوتە سەر ، بنیات نانی دەوڵەتی ئـەرمەنی قـاوی داخـستوو کەوتە نـاو نـاوان ، کێشەی نەتەوایەتی کوردیش زۆر بـە تیژی سـەری هەڵـداو بـەشێکی زۆری ئەم کێشەیە کەوتە ســـەر شانی عەشایەرو خێلە کوردەکان ، ئەوەش لەیاد نەکەین زۆر لە کوردەکان

بە لایانەوە باشترە لەلایەن ئەرمەنی یەکانەوە حوکم بکرێن نەوەك ژێردەستەی تورکەکان بن !!

ب ـ لە ٧٥٪ی کوردەکانی ئەم ناوچەیە شیعەن‌و بە نەرمی‌و میهرەبانی بە ناوبانگن • هەروەها ٢٥٪ە کەی تریش سونی مەزهەبن‌و ئەمانیش بە میهرەبانی‌و سالاری بە ناوبانگن ، ژمارەیەکی بچوکی تورکیش لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بوون‌و ئەمانیش شیعەن •

ج ـ پارێزگاری مەلاتیا کە خەلیل بەگەو لە بنەماڵەی بەدرخانی یەکانە • پیاوێکی سەنگین‌و سالارەو هەستێکی قووڵی نەتەوایەتی هەیە بەرامبەر ئینگلیزەکانیش هیچ دیاردەیەکی دوژمنایەتیم نیا بەدی نەکردووە •

## [ ٥ـی ئەیلول ]

دە رۆژ بەر لەوەی بگەینە مالاتیا ، واتا لە ٢٥ی ئابدا ، کەتیبەی سەربازی سیازدە بروسکەیەکی ناردووە بۆ پایە بەرزەکانی سوپا نە مالاتیا ، داوای ئەوەی لێ کردوون کە ئەندامە کوردەکانی کۆمەڵەکەمان بگرن • بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی سەربازەکانی لەو ناوچەیەدا کەمتر بوون لە چاو کوردەکاناو بگرە لە هیچەوە دیار نەبوون • سەرەڕای ئەوەش چەکدارێکی زۆری عەشایەر لە ناوچەکەدا ئامادە بوون ، خەلیل بەگی پارێزگاریش کارێکی باشی کردە سەر بەڕێوەبەری پۆلیس ••• لەبەر تێکرای ئەو هۆیانە دەستەڵاتی سەربازی لە بارەی ئێمەوە هیچیان پێ نەکراو کەسیان لە ئێمە پێ نەگیرا ! بۆ دڵنیایی‌یش ئەم

بروسکەیەی خوارەوەم بە تورکی نارد بۆ ئەمنیداری گشتیی‌مان لە ئەستەموولّ لە هەمان کاتیشدا دەقی بروسکەکەم لەبەر چاوی بەرێوەبەری پۆستەو تەلگراف نووسی‌یەوەو ناردم بۆ خەربوت‌و دیاربەکر : ( کە لە ئەستەموول بە ڕێکەوتین بڕوام وەهابوو کە بەرێوەبەری ناوچەکان لە ئیش‌و کارو ئامانجی وەفدەکەی ئێمە ئاگادارن ، بەلّام زۆر سەرسام بووم .

کە گەیشتینە مالاتیا نەك هیچ کاربەدەستێك پێشوازی لێنەکردین . ـ لە هاتنیشمان ئاگادا رنە بوون ـ بەلّکو هەوالّی ئەوەم زانی کە فەرماندەی کتیبەی سیازدە لە دیاربەکر بروسکەی داوە بە هەموو کاربەدەستانی مالاتیا کە ئەندامە کوردەکانی کۆمەلّەکەمان بگرن ، لە کاتێکدا نەبێ ئەوان ئیشوکاری تایبەتی من بە ئەنجام ناگات . پێویست بوو بە خێرایی چارەی کێشەکە بکەم بۆیە حوکومەتی تورکیام هەژان هەتا بە خێرایی هەوالّ بگەیەنێتە هەموو کاربەدەستانی سەربازی ناوچەکان ، بۆ ئەوەی یارمەتی‌و هاوکاری بکرێت لەگەلّ من‌و ئەندامەکانی تری کۆمەلّەکەماندا ، وە هەڕەشەیان لێ بکرێت کە بە هیچ جۆرێك دەست نەخەنە ئیش‌و کاری ئێمەوە ، بە پێچەوانەوە هەرچیەك ڕووبدات تۆبالّی بە ئەستۆی حوکومەتی تورکیایە ، ناوی ئەندامەکان :ـ

١ ـ جلادەت عالی بەدرخان ٢ ـ علی بەگ بەدرخان ٣ ـ کامەران عالی بەدرخان ٤ ـ ئەکرەم بەگی جەمیل پاشازادەی دیاربەکری ٥ ـ عبدالرحیم ئەفەندی .

# [ ٦ـی ئەیلول ]

وا دیـارە بروسکەی دوێنێمان ئیشی خـۆی کـرد ، ئـەوەتـا والی خـەربوت بـە پـەلـە تـەشریفی هێنـاوەو ئامادەیە وەفدەکەمان بە باشی بپـارێزێت‌ونە هێڵێ تووشی هیچ چورتمێك ببێن بـە دەست ئەندامـەکانی « ئیتحادو تەررەقی‌یەوە »(٤٩) !

ئـەم نـامەیەی خـوارەوە خـالیـد بـەگی فـەرماندەی کـەتیبـەی سـیازدەی دیاربەکر نـاردوویە بۆ نـەقیب عابـدین کـە نـەفسـەرێکی کـەتیبـەی غـەیرە نیزامی مالاتیایە ، بـە ڕاستی نـامەیەکی زۆر بـەتـام‌و چێژە ، بۆمان ڕوون دەکاتەوە کـە جـولانـەوەی نـەتـەوەی کورد لـە دیاربـەکردا چەند بـەهێزو پێزەو ئەوەتا تورکەکان لـەنـاو خۆیـانـدا دەی‌سەلمێنن !!

« نـامەکەم وەرگرت ، زۆر سوپاسی هەستی خاوێنت ئەکەم بەرامبەر بـە من ... بـەڵێ من تۆم لێرە دوور خستەوە ، ئەمەش بۆ تۆ بـاشترە ، خۆشەویست لەوە بـە ئاگایت کە تۆ لەلای من چەند بەرێزو بە قەدریت ، بـارو دۆخی گشتی‌ی ئەم ڕۆژە بەسەریا سەپاندم کە بـەو شـێوەیەبم لـە گەڵتـا ، بێ‌گومانم لـە یادتـە کە چۆن پێشـنیار کـرابوو لـە دیـاربەکـر یـەکتر ببینین ... نـامـەکـەت رونی دەکاتـەوە کـە مەبەست لـە بـە یـەکگەیشتنی دیـاربەکر هەمان مـەبـەستی « ئەرز ڕۆم »(٥٠) .

واتـا مـەبـەستی لـە یـەکتر بینینی دیاربەکرو ئـەرزەرومیش ئەوە بوو کـە جولانەوەیـەك بـەرپـا بکەین دژی داواکانی ئـەرمەن ، کەوایە هیچ کەسێك وەك من بـە پـەرۆش نیە بۆ ئـەو کۆبونەوەیـە ، من زۆر بـە ووردی چوومەتە قوڵایی دەروون‌و هۆشی خەڵکی دیاربەکرەوە ، بە

میکرۆسکۆپ هەموو خولیاکانی میشکیانم خوێندوەتەوە ، بە تەواو لەوە گەیشتووم کە لە ژێر پەردەی نەتەوایەتی کوردا هەندێ ئەوەیانە خۆیان بخەنە ژێر ڕکێفی ئینگلیزەوە لاوانی کورد هەواڵو دەنگو باسی وەها بڵاو دەکەنەوە کە ڕای گشتیی بوورووژێنێت ، ئەم شتانەم هەموو لە ڕێگەی ڕاپۆرتە نهێنی‌یەکانەوە وەرگرتووە ، درێژەی ئەدەمێ هەمویان خزمەتی[٥١] بەرژەوەندی‌یەکانی بەریتانیا ئەکەن ، کە مێجەر نوێل لە حوزەیرانی ڕابردوودا گەیشتە حەلەب ، جەنابی ئەکرەم بەگ هەندێ فەرمایشتی فەرمووبوو ، لە دوایشدا پێچێکی پیا هێناو خۆی نوقم کرد ، وە خەڵکی دیاربەکر بەشداری‌یان نەکرد لە کۆنگرەی ئەرزەرووم لە کاتێکدا کەلێك هەڵمان نان کە بەشداربن لەو کۆنگرەیەدا .

ئەو ڕووداوانە هەمو شتێك ڕوون دەکەنەوە ، پەردە لە ڕووی زۆر شت لا ئەدەن .. کە والی تازەیش گەیشتە ئەوێ ، لە کرۆك و ناوەرۆکی ئەو ڕووداوانە گەیشت ، بۆیەکا بڕیاری داخستنی یانەی کوردی دا ، لەبەر ئەوە خۆیشم باش ئەزانم کە چۆن تێکلاویت لەگەڵ ئەم جوڵانەوەیەدا[٥٢] ، بۆیە بڕیارم دا بە گوێزانەوەت بۆ مەلاتیا رزگارت بکەم لەو هەموو مەترسیانەی کە دەمیان لێ کردویتەوە ، منیش ناواتە خوازم کە لێرە دوور بکەومەوە چونکە کەوتومەتە گێژاوێکی دەروونی قووڵەوە ، کەوتومەتە ململان لە گەڵ چەندەها گرۆو . تەیاراتی ، جۆر بەجۆردا ، ئەوەیشت لێ ناشارمەوە کە ماقوڵانی دیاربەکر دەروونیان لەبەردە ڕەشی ناوچەکەیان ڕەشترە ... من بە جوانی لەوە گەیشتووم کە تێکرا خەڵکی ئەم ناوچەیە هەستی نیشتمانی‌یان بەرامبەر دەوڵەتی تورکیا شۆراوەتەوە ، . [ نامەکە لێرەدا تەواو ئەبێت ] .

## [ ٧ـی ئەیلول ]

خەلیـل بەگی پـارێزگار هەندێك بروسـکەی نیشـان دام کـە لـە نێـوان والی‌و وەزیـری نـاوخۆدا ئـاڵـوگۆڕ کراوەو هەمویشی بـە پـەلە بوو، ، ئەم بروسکەیەی خوارەوە وەزیری نـاوخۆی تورکیا نـاردوویـە بۆ والی‌و بەم شێوەیە دەس پێدەکات :ــ « لـە بـابـەت بروسکەی میجـەر نۆیلەوە بۆ ئەمنیـداری بـاڵای گشتی‌ی ، ئێمەیش هاتوینەتە سـەر ئـەو ڕایـە کە گرتنی بـەدرخانی‌یەکان زیانێکی گەورەی هەیە بۆ حوکومەتی تورکیا ، لـە لایەکی دیکەوە ڕاپۆرتەکانی کەتیبەی سیازدە ئەوە ئەگەیەنێت کـە پروپاگەندەی تێکۆشەرە کوردەکان لەوانـەیـە مـەترسی گـەلێ زۆرتـر بێت‌و ئێمە وایشمان ڕانـەدەبینی ، تکایـە ئێـوەیش ڕاتـان چیـە ئـاگـادارمـان بکـەن » بروسکەکە تـەواو » .

والی‌ش بـەم بروسـکەیەی خوارەوە وەزیری نـاوخۆی تورکیـای ئاگادا کردۆتەوە :ــ ( گرتنی بـەدرخانی‌یەکان بـەلای ئێمەیشـەوە ڕاست نیـە لـەبـەر ئـەم هۆیـانـە :ــ

١ ـ مێجەر نۆیل سوورە لەسەر ئەوەی کە هـەرگیز هانی ئـەوە نـادات دەسـەڵاتی حوکومەتەکەی ئێمە کز بکات ، یاخو زیانی بێت بۆی .

٢ ـ پروپاگەندەی بەدرخانی‌یەکان کارێکی ئەوتۆی نی‌یە بۆسـەر ئێمـە ، بـەڵام ڕۆژنـامەی « سەربەستی »و چاپەمەنیەکانی تری یـانـەی کوردی لـە ئەستەموڵ هـەر لـەلایـەن ئـەوانـەوە سـەربـەرشتی‌و ئـاڕاستەی سیاسی دەکرێن ، کـەچی تویش هەتا ئێستا لەم بارەیـەوە هیچ شتێکت نەکردووە[٥٣] ! .

٣ ـ گرتنی بەدرخانی‌یەکان[٥٤] دەبێتە هۆی تەقینەوەی ئاژاوەو بەرەڵایی لە ناوچەکاندا و دۆخی هەموو ناوچەکان ئاڵۆز دەبێت ، لە ڕاستیشدا ئێمە دەسەڵاتی ئەوەمان نیە لەنگەری بارو دۆخی ئەم ناوچەیە ڕابگرین •

٤ ـ بەڕای شەخسی خۆم پڕوپاگەندەی بەدرخانی‌یەکان هیچ بایەخێکی نیەو کارێکی ئەوتۆ ناکاتە سەر ئێمە بەو ڕادەیەی کە دەزگای ڕاگەیاندنی کەتیبەی سیازدە پێتان رادەگەیەنێ‌و فوی‌تێ ئەکات ( بروسکەکە تەواو ) •

* * *

ئەمڕۆ (مێجەر برۆنۆی) فەرەنسی گەیشتۆتە ناوچەکەو لەبەشی ( جیندامیریێ ) ( مەبەست لە هێزی جەندرمەیە ) ناوچەی خەربوت‌و سیواس‌دا بە شێوەی پشکنەر ( مفتش ) کار دەکات ، نایشارێتەوە کە لایەنی[٥٥] موستەفا کەمال دەگرێت ، لە زۆر دەرفەت‌و بۆنەدا ئەو پشت گرتنەی بە ئاشکرا دەربڕیوە • بەو نیازەی لە والی پاشقول بدات ، والی‌ش بە بەنە ئەم بروسکەیەی خوارەوەی بە پە لە ناردووە بۆ حوکومەتەکەی :ـ

« ئەمڕۆ ئەفسەری فەرەنسی کە پشکنەری جیندارمیری‌یە گەیشتە ئێرەو دەچێت بۆ خەربوت‌و سیواسی ، ئەم ئەفسەرە ڕاستەو ڕوو بلاوی دەکاتەوە کە پشتیوانی لە موستەفا کەمال دەکات ، وە بێزاری خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بەو هەنگاوانەی کە دژ بەو نراوە ، بە پێچەوانەی ئەفسەری ئینگلیزی مێجەر نۆیل کە دلگران نیە بە ئیجراأاتی ئێمە ، ئەو شتانە ڕاپۆرتەکانی پێشوومانی سەلماند ، کە فەرەنسی‌یەکان لە ژێرەوە لایەنگری کۆنگرەی سیواسن[٥٦] ، بۆ ئەوەی جەنابی والی

قسەکانی خۆی باشتر بسەلمێنێت فوو دەکاتە مەسەلەکەوەو دەڵێت :
( ئامێرە بێ تەلەکانی سیواسیش لەلایەن فەرەنسیەکانەوە ئیشی پێ ئەکرێت ، وە هەموو ئاژاوەو ئاڵۆزی ناوچەکە لە ئەستۆی «برۆنۆ» دایە چونکە پشتگیری لە کۆمەڵی ئیتحادو تەرەقی دەکات •

لە ١/ئەیلولدا والی بروسکەیەکی ناردووە بۆ خەلیل بەگی پاریزگار داوای لێ ئەکات کە ١٠٠ سوار چاکی کورد لە عەشرەتی ڕەشوان [٥٧] کۆبکاتەوە • بەلام خەلیل بەگ لەو بڕوایەدابوو کەئەم سەد کەسە بۆ تەمێو سەرکوتکردنی کۆمەڵێکی دیکەی کوردە ، لەبەر ئەوە بڕیار ئەدات ئەو سوارچاکانە نەخاتە ئەو کێشەیەوە ، بەڵام چون ؟ بۆ ئەوەی وەها نیشان بدات کە فەرمانەکانی والی بە دڵسۆزیەوە ئەنجام ئەدات بە ناوی والییەوە دەکاتە سەر بەدر ئاغای سەرەك عەشرەتی ڕشوان ، بەڵام خەلیل بەگ لە مێژەوە لەگەڵ سەرۆکی خێڵو عەشرەتە کوردەکاندا خۆی جوت کردووە کە هەندێ جار بەپێی دەستەلاتەکانی خۆی فەرمان دەردەکات ، بەڵام ئەوەی دژی کوردەکانە بە جۆرێکی تایبەتی ئیمزای دەکات ، بەم پەرلەیە لە کوردەکانی دەگەیەنێت کە ئەم فەرمانە ئەنجام نەدەن !!

لە سەردانی والیدا وەها دەرئەکەویت کە سەد سوارەکەی بۆ ئەوەیە بیان نێرێت بۆ کۆنگرەی سیواسی نەتەوەیی ، کە بەلای والییەوە کۆنگرەیەکی سەر بە ئیتحادو تەرەقی یە • حوکومەتی تورکیاش [٥٨] والی هەلبژاردووە کە ببێتە فەرماندەی کەتیبەی سیازدە وە مەوداو زەمینەی بو هەموو هەنگاوو کارەکانی خۆش کردووە بۆ کۆکردنەوەی ئەم میلیشیا ناوچەییانەو ناردنیان بۆ سیواس پەلەی کردووە دیارە ئەم هەنگاوانە بەلای کوردەکانەوە پۆختەی مەسەلەکان

ئالۆزتر دەکەن ، کوردەکان لە ناو خۆیاندا کەوتبونە مقۆمقۆ لەم بارەیەوە ، ئایا ئەو شتانە لە دوا رۆژدا چ کارێك دەکەنە سەر کێشەکەیان ؟

چونکە یارمەتی دانی والی خزمەتکردنی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانە ، وە ئەم خزمەتکردنە کێشەی کوردیش چەند هەنگاوێك دەباتە پێشترو زەمینەی خۆشتر دەکات بۆ پێویستی دەوڵەتێکی کوردی ، ئیدی ئەوە نەما کە دەوڵەتی بەنی عوسمان فەرمانڕەوایی بکات !! لەبەر ئەو هۆیانە بوو خەلیل بەگی پاریز گار نەك سەد بەڵکو ٥٠٠ سوارچاکی ئامادە کرد . گەورەکانی عەشایەری [ باڵیان ] بە سەردان ئەمڕۆ هاتنەلام ، لە ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی جەنگ بەرگی چوارەمدا لەبارەی بەشی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە نوسراوە باس ئەم خێڵانە دەکاتو بە (رافزی)[٥٩] ناویان دەبات ، ئەوانەی ڕاپورتەکانیان ڕێکخستووە کەوتوونەتە هەڵەیەکی سەیرەوە ، لە هەمان کاتیشدا نموونەیەکی زیندووە لەو هەڵانەی کە تووشی دەبن ، لە چ کاتێکدا ؟ لە کاتی کۆکردنەوەی زانیاری‌یەکانداو لە بابەت کۆمەڵگایەکەوە کە زمانی نەزانراوە[٦٠] ، هەڵەکردن لە کاتی وەهادا شتێکی ئاسایی‌و سروشتیە ، بە کارهێنانی وشەی ڕافزی یەکێکە لە شێوەکانی گاڵتە ، کە هەندێك لە هەڵگرانی مەزهەبە تەقلیدی‌یەکانی تر بەکاری دەهێنن دژی مەزهەبی پێنجەمی ئیسلام ، وەك دەرئەکەوێت ئەو کەسانەی کە باسی عەشرەتی «باڵیان»یان کردووە بۆ ئامادەکەرانی ئەو ڕاپۆرتە بەناوی ڕافزی ناویان بردوون کەچی ئەم عەشرەتە شیعەن .

## [ ٨ـی ئەیلول ]

ئەمڕۆ چەند کاغەزێك کەوتمە پشکنینی تۆماری سەر ژمێرە ڕەسمیەکان لە بارەی دانیشتوانی ناوچەکەوە ، ئەرمەنی‌یەکان سوور لەسەر ئەوەی کە تورکەکان چالاکانەو بە ناپاکی دەستیان خستۆتە ئەو تۆمارانە ، وە ژمارەی موسلمانەکان بە شێوەیەك گەورە کراوە کە ژمارەی ئەرمەنی‌یەکان لەچاو خەڵکی وولاتدا نزیکە لە هیچەوە .

یاسای سەرژمێری دانیشتووەکان بەم شێوەی خوارەوە ئەنجام ئەدرێت :ـ کاربەدەستانی تایبەتی دەنێرن بە دووی کوێخای دێکاندا بەپێ ئەوەی بزانن بۆچی بانگ کراوون ، کە گەیشتنە لای کاربەدەستان هەموو زانیاری‌یەکان لە بارەی ژمارەی خانوو ، خێزانی دێکانیان ، ژمارەی خێزانەکان ئەوانە هەموو لێیان ئەدزن‌و دەیخەنە سەر لیستەکان‌و ناوی هەندێك لە ئەندامی خیزانەکانیش دەخەنە پال ئەو لستانە ، یەکەم سەرژمێری ڕەسمی دانیشتوانی تورکیا لە ساڵی ١٩٠٥دا بوو ، دەزگایەك لە تلوودارانی ناوچەکە هەڵسا بە ئەنجامدانی سەرژمێرەکە ، بە نۆرە هەموویان سەریان لە دێکان داو ناوی هەموو دانیشتوانیان خستە سەر لیستە .

ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە سەرژمێری نەسڵی‌یەکەوە تۆمارەکانیان بە شێوەیەکی پوخت‌و ڕاست دەستنووس کرابوون ، بەڵام لە دوای‌دا ئەو تۆمارانە خرابوونە پشتگوێ‌و بە باشی نەیان پاراستبوون ، بۆ نموونە :ـ

نیوەی ژمارەی مردووەکان ، زاووزێ تازەکان ، دیاردە کۆمەلایەتی‌یەکانی نر وەك جیابوونەوە ، ژن هێنان ... نەدرابوونە

قەلەم • پێویستە سەرە نجیش بۆ ئەوە ڕابکێشین کە دێ سەرژمێر کراوەکان کەوتونەتە قەزایەکی جەنجاڵو نزیك بە شارێکی گەورەن ، جگە لەمەیش تورکەکان خۆیان دان بەوەدا ئەنێن کە دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان لە ٤٠٪ی خێڵەکین و هەمیشە خۆیان لەسەر ژمێرو تۆمارکردن ئەدزنەوە • بۆ ئەوەی راستی لەم مەیدانەدا ووز نەبێت ئەمەش دەڵێم کە سەرژمێری تورکی هەرچەندە کەموکورتی بووە ـ ئەوەیش بەڕادەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە سەرژمێرەکەیان کردووە ـ بەڵام هەوڵو کۆششێکی پیرۆزو ڕەسەنە بۆ ئامادە کردنی تۆمارێکی پوختەی دانیشتوان ، سادەترین تۆژینەوەی کێشەکان بۆمانی ڕوون دەکاتەوە کە هیچ جۆرە تەقەلایەکی چالاکانە ناتوانێت تۆماری سەرژمێرەکان پۆخڵە بکاتو دەستی تێوەربدات •

بەداخەوە مالایام بەجێ‌هێشت فریای ئەوە نەکەوتم تۆماری دێهاتە موسڵمانەکان بپشکنم ، بەڵام لە ئەنجامی هەندێك هۆی بابەتی گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە ڕێژەی سەدیی قەبلاندنی دانیشتوانی

ئەرمەن زۆر کەمترە لەچاو قەبارەی موسڵمانەکاندا ، ئەرمەنییەکان بە گشتیی لە شارو دێهاتە گەورەکانو پێدەشتەکاندا ئەژیان ، واتا سەرژمێر کردنی ئەرمەنییەکان لەم شوێنانەدا بەبێ هیچ کۆسپێك ئەنجام ئەدرا ، جگە لەمەش ئەرمەنییەکان باجی ( نەکردنی سەربازی )یان ئەدا ، بەو هۆیەوە تورکەکان هەڵپەیان ئەکرد بۆ ئەوەی پوختەترین ڕاپۆرتی سەرژمێریی ئەرمەنییەکانیان لەلابێت ، چونکە لەو کاتەدا خەزینەی دەوڵەت لاوازو بێ گریك بوو ئەو باجە داهاتێکی باش بوو •

ئەو کەسانەی سەرژمێرەکانیان ئەنجام ئەدا تووشی گەڵێك کۆسپو تەگەرە دەهاتن ، بە تایبەتی بۆ ئەو دێهاتانەی کە کاربەدەستانی ناوچەکان

خۆیان دروستیان دەکردنو دەیانخستنە سەر موڵکەکانی تریان • ئەو تازە دێیانە لە هیچ تۆمارو دەفتەرێکا ناوو نیشانیان نەبوو ، باری گشت کۆمەڵی ئەرمەنیش کەڵکی ئەوەی نەبوو کە چەند کاربەدەستێکی دیارو بەزاخی تیا هەڵکەوێتو ئەمانیش بە هۆی کاربەدەستەکانیانەوە « چەبوگوپی » بکەنو هەندێك مافی تایبەتی بپچڕن[61] بۆخۆیان •

## [ ٩ـی ئەیلول ]

فەرماندەی سەربازی ناوچەو کەتیبەی سیازدە کە بە بنەچە عەرەبەو ناوی جوێت بەگە ئەم بروسکەیەی خوارەوەی بە هەموو ناوچەکەدا ڕاگەیاند لەبەر ئەوەی کە بروسکەیەکی سەیرەو بە ئاشکرا هێڵە نەبەرەتییەکانی پروپاگەندەی ئیسلامی دژ بە ئینگلیزەکان دەخاتە ڕوو ، بە باشترم زانی کە دەقەکەی وەربگرین :ـ بروسکەی ژمارە $\frac{٦٠٢}{٩٠٠}$ لە ٩/ئەیلول/١٩١٩دا • دەقی بروسکەکە •

ئەو کۆمەڵەی کە ئەفسەری ئینگلیزی[62] سەرۆکیەتیو لەم دوایەدا گەیشتۆتە مالاتیا چەند داوو ئەخشەی بۆگەنی لە ژێر سەردایە دژ بە وڵاتی باوكو باپیرمان ، ئەو ئەفسەرەی بە ناو مێجەر نۆیلەو کەوتۆتە گەرانو فاکوفیك ، دوو مانگیش لەمەوبەر چۆتە دیاربەکرو[63] بەبێ پەردە دابەزیوەتە سەر حوکومەتی تورکیاو برێ پرو پاگەندەیشی دژ بە دەولەت[64] بلاوکردۆتەوە ، پارەو پوڵێکی زۆریشی بە بەرتیل داوە بە سەرۆکی عەشرەتی میللی ، ئەمیش گفتی داوە کە لە ماوەی ئەش هەفتەیەکدا هەموو کاربەدەستو مووچەخۆرێکی تورکی لەم ناوچەیەدا قاوبداو دەریان بکات ،

بۆ خەڵك ، بەڵام لە هەموو شوێنێكدا بە دژی خواستو هیوای جەنابی یانەوە وەڵام ئەدرایەوە ، یەكێك لە هاورێكانی مێجر نۆیلیش كە ئەكرەم بەگی جەمیل پاشا زادەی دیاربەكری یە ... ئەو پیاوە شێتەی كە نەك هەر دانیشتوانی شارەكەی خۆشیان ناوێت بەڵكو لەناو خێزانەكەی[٦٥] خۆیشی‌دا سووكە . ئاخو داخ بۆ هەموو خەڵكە بە شەرەفەكان ، بە درێژایی ٦٠٠ ساڵ ئیسلام بوونو قوربانیان‌دا لە پێناویا ، گەلەكەمان پێكهاتبو لە كورد ، تورك ، عەرەب ، ئەلبان ، لە جەنگی بولقانا ئەلبانی‌یەكانیان بە بەندوو باوی سەربەخۆیی لە خشتە برد ، ئەمڕۆیش كە جیهان پڕكراوە لە باسی نەتەوە بچووكەكان بە هیچ جۆرێكیش ناوی ئەلبان لە كوولەكەی ئەمڕا نیە !!

لەكاتی جەنگیشدا حسینی شەریفی[٦٦] مكەیان لە خشتەبرد بە باوی پاشایەتی حیجازەوە ، ئەوەتە ئەپاڕێتەوە كە سوریاو فەلەستینو جەزائیرو تەرابلسو عیراقیش بخرێتە سەر پاشا نشینەكەی .

بەڵام پاڕانەوەكەی بە هیچ گوێیەك ئاشنا نی‌یە ، بە پێچەوانەوە ئەو وڵاتانە دابەش‌كران بەسەر چەند دەوڵەتێكی بێگانەدا ، وە لەلایەن ئەوانەوە بەڕێوە ئەبرێن ، بەو جۆرە برا عەرەبەكانیان لە ئێمە دابڕیو ئێستەش ئەو كەسانەی[٦٧] كە عەرەبیان لە ئێمە دابڕی كوردیشیان لە ئێمە كرد .

پێویستە بۆ مێژوو ئەمە بڵێم كە جگە لە هەندێك سەرێچیو پۆت شكاندنی پرشو بڵاو نەبێت كوردەكان بەوە ناسراون كە سۆزو هەستێكی ناسكیان هەیە بەرامبەر ئاینی ئیسلام ، وە هەمیشە بە چاوێكی شكۆو سامەوە تەماشای خەلافەتیان كردووە ، ئێستایش بەو

هیوایەن کە پەیوەندی یە کۆن و نەریتیەکان لەگەڵ ئاینی ئیسلام و حوکومەتی تورکیادا هەر بەردەوام گەشەدار بێت •

ئەفسەری ئینگلیزی کە دەڵێن عەقیدە « لە ڕاستی دا هەمان « زائدە » کە ئەفسەری سیاسی بوو لە سلیمانی و شیخ محمودیشی[٦٨] لە خشتەبردو هەمان شێخیشە کە ئەمڕۆ مەردانە کەوتوتە جەنگ و ململان لەگەڵ هێزە داگیرکەرەکانی ئینگلیزدا ، دوو مانگێک لەمەو پێش ئەفسەرێکی ئینگلیزی لە قەفقازەوە بە پارێزگاری بایزیدی[٦٩] ڕای گەیاند کە لەبەر ئەوەی ( سنجق ) دراوە بە ئەرمەنی یەکان ، پێویستە شارەکەیان بۆ چۆڵ بکرێت،ئەفسەری بەشی سیاسی لە ڕەواندزیش داوای کرد کە پێویستە ناوچەی شەمدینان چۆڵ بکرێت • بەلام ئینگلیزەکان کارناکەنە سەر کەس و بە زۆرنایان کەس هەڵنایەرێت ، ئەوەتە خۆ پیشاندانی[٧٠] نەتەوایەتی لە ئەرزەڕوم گەشەو تەشەنەی کردووە، عەشایەری سلیمانی ، زاخۆ ، ئامێدی ، دەستیان داوەتە جەنگێکی سەخت ، پاڵەوانانە لەگەڵ ئینگلیزی داگیرکەر « ئەگەر ئینگلیزەکان ڕاست دەکەن و بە دڵ ئەیانەوێت کوردەکان سەربەخۆ بن ئەی ئەو هەموو شۆرش و[٧١] ڕاپەرینانە لە ڕوویانا بەجی پێنە دەکەن ؟؟

خەڵکینە خوا پشتیواتتان بێت بە قسەی لووس و شیرین ، بە درۆو دەلەسە نەخەڵەتێن و لە خشتەتان نەبەن « کوردو تورك برای یەکن ، هەردوکیان پشت و پەنای بەتینی ئاینی ئیسلامن لەم ولاتەدا « لە یەکتر دابڕان ئاینی ئیسلام لاواز[٧٢] دەکات •

تورك ئەتوانێت بەبێ کورد بژی بەلام کوردەکان کە هاوسێی عەرەب و فارس و ئەرمەنین[٧٣] ناتوانن بە تەنها بمێننەوە «بەتریارکی»[٧٤]

ئەرمەنی لە ئەمەرکیا هەموومان ئەکات بە کۆیلەی ئەرمەنی‌یەکان ، هەرچەند ئەوانەی کە ناپاکو دەخەڵن‌و خزمەتی ئینگلیزەکان دەکەن[٧٥] سێ‌وچوار کەسێکن بەلام پێویستە هەرگیز ڕاستی لەیاد نەکەین‌و لە هەمان کاتیشدا خۆمان نەتکێنینە ـ توریط ـ ئەو خۆپیشاندانانەی کە دژ بە ئاشتەوای[٧٦] دەوڵەتانن .

( کۆتایی بروسکەی فەرمانەی کەتیبەی سیازدەو هێزە سەربازی‌یەکانی ناوچەکە )

# [ ١٠ـی ئەیلول ]

لەگەڵ هەڵهاتنی یەکەم تیشکی زێڕینی شەفەق‌دا بەم هەواڵە خۆشە بێدار کراین کە پۆلێك سەرباز لەگەڵ هەندێك هێستر سوارو دوو ڕەشاش ئۆتوماتیکا بەرەو شار کەوتوونەتە ڕێ مەبەستیش لە هاتنیان گرتنی ئێمەیە !!

بە بیستنی ئەم هەواڵە کەوتینە پێچانەوەی چادرو جرو جانتامان لە کاتژێری حەوت‌دا کاروانمان بەرەو شاخەکانی [ باشوور ] کەوتە ڕێ ، پایزگارو حاجی بەدر ئاغای سەرخێڵی ڕەشوان‌و والی‌و چەند کوردێکی تر لە ئێمە دواکەوتن ، چونکە بڕیار وەها بوو بێن‌و پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵەکەی ئێمەدا بدوێن ، جەمال بەگی فەرمانەدەی گشتی‌ی تیپی سوارە کە یەکێك بوو لە دڵسۆزانی سەر بە ئیتحادو تورەقی هەواڵی ڕاکردنی ئێمەی پێدرابوو ، ئەوەیشی دەزانی کە هێزێکی سەربازی بۆ پاڵپشت‌و یارمەتی کەوتۆتە ڕێ ، ئەمانە هەموو هانی ئەوەی‌دا کە بە توندی فەرمانی گرتنی بەدرخانی‌یەکان ئەنجام بدات ، لە دوای کاتژێریك ڕێگابڕین ، هەواڵی ئەوەی زانی کە کەوتونەتە شوێنمان ، تیپی سوارە

کە (٤٠) کەسێك دەبوون سوودێکی باشیان لە دارستانی چڕی ئەم ناوچەیە بینی ، لە هەموو لایەکەوە لە دەربەندێکی زۆر سەختا گەمارۆیان داین ، بە ڕاستی هەڵوێستێکی زۆر ناله‌بارو سەخت بوو چونکە ئێمە تەنها دە تفەنگمان لەگەڵا بوو لەبەر ئەمە پێویست بوو بکەوینە فێڵو تەڵەکەبازی ، ئەفسەرێکی تورکی کە فەرماندەی سوارەکان بوو دوو پیاوی ناردە لام کە خۆم بدەم بەدەستەوە ، منیش پێم ڕاگەیاند کە بڵێن بە گەورەکەیان پێویستە بێتە ئێرەو چاوی پێم بکەوێت هەتا بە بە درێژی باسی کێشەکان بکەین ، لە پاش تۆزێك خۆی بە سەرشۆڕی هات بۆ لامان‌و پیاوەکانی ئێمەیش گەمارۆیان دا ، منیش دەمانچەم لێ ڕاکێشاو لەگەڵ یەکێکی بەدرخانی‌یەکاندا ـ وەك تەرجومانێك ـ بە فیزێکەوە ڕووبەڕووی تێکرد ، ئەفسەرەکە ووتی ئێمە بۆ گرتنی تۆ نە هاتووین بەڵکو بە تەنها هاتووین بۆ گرتنی بەدرخانی‌یەکان‌و ئەو کوردانەی لەگەڵتان ، منیش پێم ووت :ـ ئەم قسەی تۆیە مانای وەهایە بکەوینە جەنگ لەگەڵ یەکترو بێین بە یەکدا ، کە ئەمەی لەمن بیست بۆ ماوەیەك چوو بە خایاڵ‌داو لەوە نەگەیشتم هۆی گەمارۆی تفەنگەکان بوو یاخود نەی ئەوێرا بچێتە ژێر ئەو داری شکستەیەوە کە ئەفسەرێکی ئینگیزی بگرێت ...

هاتەوە گۆو ووتی :ـ

ئەتوانن بڕۆن !! بە ڕوویەکی گرژو مۆنەوە لەسەر شاخەکە هەڵتوتابوو تەماشای کۆڵو بارگەی ئێمەی دەکرد .

یەکێك لە پیاوەکانی ئێمە تۆزێك بەجێما ، ئەفسەرەکە نەڕاندی بەسەریا بڵێ بە ئەفسەری ئینگیزی ئەگەر ئابڕوی خۆی خۆش دەوێت

دەمێنێت بە بەدرخانی یەکانەوە با بڕۆن ، منیش جارێکی تر دیمەوە بۆلای ، ئەو کاتە ئەتوانێت بلێ ئەو کوردانە کە پێویستە بگیرێن هەڵهاتوونو ڕایان کردووە ئەم بیانوەیشم بڕی ، بەڵام کرزیو سەغلەتی هەر دەمو چاویان بەرنەدا !! کەوتینە هەڵزنان بە شاخێکی دوو هەزار پێی بەرزا ، لە کازێری دووی نیوەڕۆدا لەباڵ دێی ڕەشواندا چادرمان لێهەلدا ، ئێوارەیش والیو پارێزگارو حاجی بەدر ئاغا بەبێ چورتم گەیشتە لامان ، لە ڕێگایش گەیشتبوو نە سوارکانی تورک ، والی ویستبووی بیاندوێنێ ، بەڵام سەرنەکەوتبو .

# [ ١١ ـی ئەیلول ]

باری وڵات تا ڕادەیەك تەمو مژو ئاڵۆزە ، ئەمڕۆ والی ئاگاداری کردین کە سوڵتان ئەم فەرمانەی خوارەوەی بۆ ناردووە ، وە پێویستە بە پێی ئەو فەرمانە هەنگاو بنێت کە سوارێکی زۆر لەو کوردانەی کە جێگەی متمانەن کۆ بکاتەوەو بیان نێرێتە سەر موستەفا کەمال لە سیواس ، لە لایەکی تریشەوە مۆچیاری والی دەکات هەرکە زاڵ بوون بەسەر ئیتحادی یەکانداو سەرکوت کران بە پەلە کوردەکان بەرەڵا بکاو پوولێکیان پێوە بنێتو میلیشیات لە تورکەکان دروست بکات، چونکە ئەو سوارانەی کە ئەمڕۆ لەگەڵ والی دەڕۆن بۆ سەرکوت کردنی موستەفا کەمال سبەی وەرەقی لێ هەڵئەگێڕنەوەو مەسەلەکە دەخەنە ئەو بارەی کە داوای مامی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن ( بە قسەی ئەو . وەرگێڕەران ) .

منیش دەڵێم کوردەکان زۆر باش لەوە گەیشتبوون کە ئەگەر بڕۆن بۆ ( سیواس )و سەرکوتی تورکە یاخی بووەکان بکەن بۆ کێشەی

نەتەوایەتی یەکەی خۆیان هیچ سودێك نابینن ، لەبەر ئەمە بڕیاریان دا کە ڕۆیشتنی بۆ سیواس ـ کە چەند کازێرێك لە مالاتیاوە دوورە ـ و هێرش بردنە سەر تورکەکان ئیشێکی کاڵو کرچەو دووربینی تیا نی یە ، دیارە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لەگەڵ خواستی والی‌و گەورەکانیا ناگونجێت ، چونکە ئەوان زۆرتر لەوە تۆقی بوون کە کار لەکار بترازێ‌و جڵەوی دەسەلات بکەوێتە سەرو کلاوی کوردەکان ، ئەو کاتە بە تەواوی مالاتیا دەگرنە ژێر چنگی خۆیان کە ناوچەیەکی بەربلاوی کوردە ، لە دوایی دا ئەوەشم زانی کە مەبەست لە فێڵو تەلەکەبازی یەکەمجاری والی بۆ گرتنی کوردەکانی هاوڕێم ئەوە بووە کە کارێکی شەخسی بکاتە سەر من بۆ ئەوەی لەناو کوردەکاندا پشتگیری بکەم‌و هەوڵیان بنێم بۆ ڕێکخستنی هێزێکی باش لەوان‌و بیانێرنە سەر تورکە یاخی بووەکانی سیواس ، منیش بێجگە لە هەندێك کێشەی بچووکی بێ بایەخ کە پێویست بوو لایەنی حوکومەتی تورکی بگرم ئیدی بە بێ پەردە دەرم بڕی کەمن هەرگیز خۆم ناکێشمە ئەو کێشەو دەنگ‌و باسانەوە ـ .

## [ ١٢ـی ئەیلول ]

لەم دوایی یەدا والی هاتە سەر ئەو قەناعەتەی کە هێرشێکی عەشایەری کورد بۆ سەر ( سیواس ) هەنگاوێکە پڕە لە هەڵەشەو مەترسی‌و ئەنجامی باش نابێت ، لەبەر ئەم هۆیە بە پەلە بڕیاری دا کە هێزی عەشایەری کوردەکان بلاوەی پێ بکرێت ، سەرۆکەکانی کورد ئەو بڕیارەیان زۆر پێخۆش بوو ، ئەو سەرۆکانە کە جەنگی جیهانی یەکەم سام‌و ڕێزێکی زۆری بۆ بچری بوون ، بە مانایەکی دیکە ـ ئازایی‌و جەنگاوەری ـ خێڵەکانی کورد ، چەك‌و جبەخانەی باشی ـ کە لە کۆمەڵی

ئیتحادو تەررەقی یەوە دەستیان کەوتبوو۔ بێ ئیتفاقی کردبوون، بە پێچەوانەی هێزی سوارەی کوردەوە ( غەیرە نیزامی کە لەلایەن دەولەتەوە پاڵپشت دەکران بە سوارەی حەمیدی بە ناوبانگ بوون ـ وەرگێر ) کە زۆر بوودەڵەو کەم تفاق و پەشیمان بوون .

هەتا سەرۆکەکانی کوردیش لە یەکتر دابڕاوبن ، تا نەزانن بۆچی تێ ئەکۆشن یەکیەتی نەتەوایەتی یان دژ بە حوکومەتی تورکیا لاوازترو بگرە ئیفلیجیش دەبێ ، هەمیشە ئەو دابڕان لە یەکترە بە سوودی دوژمنەکانیان تەواو دەبێت ، ئەویش تورکەکانە .

لە ئێوارەدا وەفدێکی کۆمەڵی ئیتحادو تەررەقی لە شارەوە گەیشتە دێیەکی دراوسێ ، بەو نیازەی کە بکەونە گفتو گۆ لەگەڵ حاجی بەدر ئاغای سەرۆك عەشرەتی رەشواندا ، بە ئومێدی ئەوەی کە لە خشتەی بەرن و لە والی دای بڕن و بێت بە لایەنگری ئەوان ، بە تایبەتی کۆمەڵی سیواس ئەوەیان دەزانی کە حاجی ناوبراو هەستی سۆزێکی ئاینیی یەجگار خستی هەیە ، حاجی کایا ( caga )

یەکێك بوو لە کەلە پیاوی ئەو وەفدە یەکێکیش بوو لەو کەسانەی کە قەسابخانەی مالاتیای بەرپا کرد ، لە ئەنجامی ئەو کوشتارەدا حوکومەتی مەرکەزی تورکیا فەرمانی گرتنی دەرکردو حاجیش پەنای بردە بەر شاخەکان ، ئەوەتا ئێستایش جەنابی پیاو ماقوولی کۆمەڵەو پایەو رێزێکی زۆری هەیە لە جوولانەوەی موستەفا کەمالدا !!

لە عەسری ئەمرۆدا کۆلۆنێل بێل ئەفسەری سیاسی گشت ناوچەی باشوور گەیشتەوە حەلەب ، نامەیەکی بۆ ناردم کە یەکتر ببینین .

## [ ١٣ـی ئەیلول ]

هەرچەند متمانەیەکی وەهام نەبوو بە « ڕێکخراوەکانی ئیتحادو تەرەقی ، بەڵام نامەیەکم نارد بۆ کۆلۆنیل بیل لەو نامەیەدا پێشنیارم کردبوو کە لە شوێنێکی بێ لایەنی دەرەوەی مالاتیا یەکتر ببینین ، بەڵام کە گەیشتمە شوێنی دیاری کراو هەواڵبەری تایبەتی نامەیەکی پێدام کە تیا دەڵێت کۆلۆنێل بیل بە هەر سزایەك بووە ئەوەی دابین کردووە کە بچم بۆ شارو شەوێك لەوێ بمێنمەوە ، منیش لەگەڵ دوو چەکداری کوردا بەرەو شار کەوتمە ڕێ .

لە پاش توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی دورو درێژ لەگەڵ بیلدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە من لە دۆخ و بارێکی تازەی سەخت و ئاڵۆزدا دەژیم ، زەحمەتیشە لە دۆخێکی وەهادا بتوانم درێژە بە گەشتەکەم بدەم چونکە من کەوتومەتە ژێر زەحمەتی هێزە چەکدارەکانی ئەو ناوچەیەوە[٧٧] . باشترین ڕێگا ئەوەبە کە خۆم و کۆمەڵەکەم بگەڕێنەوە بۆ حەلەب ، ئەمڕۆ لەشاردا ( شاری مەلاتیا ) ئاشووب و ئاڵوزی یەك ڕووی دا ، کاربەدەستانی تورك هەڵگرتنی چەکیان قەدەغە کرد بەڵام کوردەکان بەوە قایل نەبوون و بە توندی بەرەنگاری وەستانەوە .

## [ ١٤ـى ئەيلول ]

لەگەڵ هەندێك جەندرمەی[٧٨] تورکدا لە هەمان ڕێگەوە گەڕامەوە لای مەفرەزەکانی ڕەشوان بۆ ئەوەی لە گازێری چواری دوای نیوەڕۆدا بگەمەوە سەربازگا[٧٩] ترسناکەکەی خۆمان بۆ ئەو مەبەستەیش بە ڕێگای (کیاختە)دا[٨٠] هەتا دەمەو شەفەق ڕێم کردووە •

## [ ١٥ ، ١٦ـى ئەیلول ]

ڕێگایەکی دوورو درێژمان بە ناوچەیەکی شاخاوی‌دا بڕی ، هەتا گەیشتینە هەوارگەی کوردەکانی ڕەشوان کە دەکەوێتە دامێنی شاخەکان‌و سەرەتای پێدەشتی ناوچەی دووئاوان کە بە ( عەرەبستان ) ناسراوە • ئەو خێلانەی کە لە ڕێگا تووشیان بووین زۆر بەیان پرچەك بوون ، قۆناخی چەکەکانیان بە تاڵی زیوی چنرابوون • پرسیارمان لێ‌کردن کە بۆچی چەکەکانیان کۆن‌و پەرپوتن ؟ دەیان‌ووت هۆی ئەوەیە کە کەوتونەتە ناوچەیەکی شاخاوی‌و سەختەوە ، دوورن لەو ڕێگاو بانانەی کە سوپاکان لەپاش ئاگربەس ( هدنە )و ئاشتەوایی لێوەی دەکشانەوە ، ئەگەر وەها دوور نەبونایە لەو ڕێگا گشتی‌یانەوە دەیان‌توانی سەربازەکان قایل بکەن کە چەك‌و جبەخانەیان بە چەند مەجیدی‌یەك لێ‌بکڕن ، تفەنگێکی تورکی بە ٨ تا ١٠ لیرەی ئاڵتوون دەفرۆشراو ١٠٠ فیشەکیشی بە ٥ تا ١٠ مەجیدی بوو ، تفەنگی ڕووسیی لەم ناوچەیەدا هەر زاتر بوو •

# [ ١٧ــی ئەیلول ]

لـه ـ کولیك ـ ەوە بـە نـاوچەی ( بێزیك )دا گەیشتینە (بریمان)، وشەی (بێزیك) تێکەڵـە لـە دوو وشەی ( بێ ) و «زك» ، واتـا رۆلەکانی ئەم خێڵە زۆربـەیان فەدباریكو بـاڵابەرزو شەنگو شۆخن !!

لامـان دایـە دێیەکی بچووكو خۆمان بـە ئـاوو دۆیەکی خەست مڕ کرد ، لـە دوورەوە پیرەمێردێکی ڕدێن سپیم کـەوتـە بەرچاو کـەم لـەژێر درەختێکی سەوزی پـەلو پۆدارا دانیشتبو ، لێی چومە پێشەوەو پێم ووت :ـ حوکومەتی تورکیا سـەرەڕای هەموو شتێك حوکومەتێکی ئیسلامییەو گەلێك شتی هەیە کە شیاوی بـاسـە ، لـەبـەر ئـەمە تـۆ لـە قولایی دەروتەوە هەست نـاکەیت کە تورکەکانت خۆش بوێـت ؟

ـــ تۆیش دەتەوێت تورکم خۆ شبوێت ؟ ، ( ئـەم پرسیارەی بـە پەستیو زویربوونەوە کرد ) چۆن یەکێکم خۆش دەوێت چاومی دەرهێنابێتو کوێری کردبم ؟!

ـــ ( بـە هەنـاسـەیەکی پـر لـە نـاسۆرەوە ) بـەڵێ ماوەیەکی زۆرە خێزانو کوڕو کێلکەو ئاوگۆتاڵی خۆمم نـەدیوە !!

بـەپێی ئـەو زانیاریانەی کـە لـە شوانەکانی ئـەم نـاوچـەیـەوە وەرم گرتوون مەرێك پێویستی بە[٨١] خوێ هەیە لـە مانگێکدا، واتـا خێزانێك ئەگەر (٥٠) سەر مەڕی هەبێت لـە سـاڵێکا پێویستی بـە ( ٢٠٠ ) هـەیـە کـە بـە پـێی نرخی حوکومەتیش بێت (٢٠٠) قروشە کـە دەکاتـە پـاوەندێكو یازدە قروش . حوکومەتی تورکیا دەرهێنـانی خوێی قورخ[٨٢] (ئیحتکار) کردووە بۆ خۆی ، وە نرخی فـرۆشـتنی چەندین جار زیاترە لـەو پـارەیەی کـە تێی چووە ، بـاجی سـەرێك مـەڕ یـا بزن ١٧½ قـروشی کاغەزەو بـاجی داهـاتی (٥٠) پـاوەنـدیش

ئەمەش پیاوەندە ، بەو شێوەیەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە قورخ کردنی خوێو فرۆشتنی بەو نرخە گرانە کارێکی زۆر دژوارو نالەباری بۆ دانیشتوانی ئەم ولاتە گەورەو بەربلاوە دروست کردووە •

## [ ١٨ـی ئەیلول ]

دێی بریمان‌مان بەجێ هێشتو لەپاش کاژێرێک بەلەمێکی دێی ( سام‌سات ) ئێمەی پەڕاندەوە ، چەند مالێکی ئەرمەنی ئەم دێیە نیشتەجێن ، ئەم مالانە بەهۆی ساوپەنای حاجی شیخ ئاغای سەر خێلی ( بێزک )ەوە لە کوشتنی خۆیان رزگار کردبوو ، ئەو سەرخێلە جلو بەرگو ناوی کوردی لێنابوون‌و لەناو عەشرەتەکەیدا حەشاری دابوون ، ••• ئەو راستی‌یانە ئیستیفانیش کوڕی ( پالۆ )ی ئەرمەنی بۆی گێڕاینەوە • ئیستیفانیش لە کاتی کوشتاری ئەرمەنی‌یەکاندا لە دێی حسین منصور ەوە ڕای کردبوو • خۆی گەیاندبووە پەنای حاجی شیخ ئاغاو ئەمیش خۆیو خێزانەکەی پەنادابوو ، شوێن‌و خواردن‌و هەموو پێداویستێکی ژیانی بۆ ئامادەکردبوون ، لە کاتی پەڕینەوەمان لە فورات ژنێکی ئەرمەنی هاتە ناومان ، ئەم ژنەرەك خۆی دەی گێرایەوە خەلکی ولانی ڕۆمەو لە بەهاری سالی (١٩١٥)ەوە لەگەل (کابوس)ی کوڕیو چەند کەسێکی تردا هاتوونەتە دێی ( سام‌سات ) ، لێرە کوڕەکەی نەخۆش‌و لاواز دەکەوێت • چاری نامێنێت ئەی‌داتە دەست یەکێ لە پیاوە عاقوولانی دێ کە ناوی ( شیخ حمەکەیە ) ئەویش زۆر بە میهرەبانی‌یەوە دەیباتە لای خۆیو چاودانی دەکات • ئەو ژنە کە گەڕایەوە بۆ (ئۆرفا) ئەی‌ویست کوڕەکەی جێ‌بمێنێت بۆیەکا رۆیشتەوە بۆ ناوچەی ( سام‌سات ) دێی بریمان ،

شیخ حمه کەیشی بەبێ هیچ پەلپو بیانوویەك کوڕەکەی بە پۆشتەو پەرداخیو لەشساخی دایەوە دەستدایکی • ئێرەدا پێویستە تەماشایەکی مەسەلەکە بەم شێوەیە بکەین :ـ ئافرەتێکی ئەرمەنی خۆی بخاتە مەترسییەوەو بچێتە دێیەکی کوردەوە کە لەژێر دەسەلاتی داگیرکەری ئینگلیزدا نەبێت بۆ وەرگرتنەوەی منالەکەی ، ئەوانیش بەبێ هیچ تەگەرەیەكو بگرە دەستی قەدرو حورمەتیشی بخەنە سەرو منالەکەی بدەنەوە !! لە کوڕەکەمپرسی :ـ

ــ کوردەکان باش بوون لەگەلتا ؟

ــ بۆ باش نەبن ؟ خۆ منیش لەوانمو کوردم •

دایکی دەیووت ئەوەندە بەمیهرەبانیو سۆزی باوکانە مامەلەیان لەگەل کردبوو ، هۆگرو ئالوودەی ئەوان بووبوو ، زۆر بە ستەم ڕازیی بوو کە لەگەلما بگەڕێتەوە !!

هەندێ ئەرمەنی دیکە ئەم دەنگو باسی منالە بە جۆرێکی تر دەگێڕنەوە ، لەو بڕوایەدان کە گوایا ئەو منالە لەناو کوردەکانا بە چاوی کۆیلە تەماشاکراوەو بە هەوەسی خۆیان ڕەتانوویانەو ئیشیان پێکردووە ، بەلام ڕاستییەکی زەقی دیکە هەیە ئەو گەزافە لە بندا هەلتەتەکێنێو بە درۆیان دەخاتەوە ، ڕاستییەکەش ئەمەیە :ـ

نرخی لیرەیەك لە سالەکانی ١٩١٧ـ١٩١٨ دا دوو شلن ـ یەك پاوەند ـ بووە ، هەموو ڕۆژێك هەزارەها موسلمان لە برسا دەمردن[٨٣]، ئەو دوو نموونەیەی کە لە سەر برایەتی کوردو ئەرمەن باسمان کردن نموونەی تاكو بێ رەنگ نین ، لەو ناوچانەدا کە کوردو ئەرمەنی تیا دەژینو هاوبەشن ، دەها چیرۆکی سەیرتر لە هەموو کونو

قوزبنێکدا دەبیسی ، سەرەڕای ئەو هەموو هەڵوێستە پاکو پڕ جوامێری یانە لەگەڵ هاوسێ ئەرمەنی یەکانا ، کوردەکان لەم ئاقارەدا هیچ شورەتو ناوێکیان وەدەست نەهێناوە (٨٤) ، چونکە لە ئەنجامی ٤٠٠ ساڵ ژێر دەستی ئیستیعماری عوسمانیدا هێشتا زمانێکی نوسراویان نی یە ، لەناو گەلانا دەنگێکی پوختو ئاشکرایان نی یە کە گەڕیدە ئەوروپایی یەکان هاتونەتە ناوچە کوردەکان ، لە سەیارەیەکدا تەموجوماتێکی ئەرمەنی یاخۆ تورکیان لەگەڵ خۆیان هێناوە ، باری سەرنجیان تەنها ڕووی کردۆتە سروشت ، کاتێ کە باسی نەریتو ڕەوشتی خەڵکیان کردووە تەنها باسی ئەو شارە جەنجاڵانەیان کردووە کە جەمەی هاتووە لە سەدەما لایەنگرانو دڵسۆزانی موستەفا کەمالی یاخی بوو ، جگە لە دەما کۆمەڵو ڕێکخراوی ئەرمەنی یەکان ، نازانم بۆچی ئەوروپایی یەکان باسێکی پوختی میوانداریو نەریتو ڕەوشتی کوردەکانیان نەکردووە کە خاوەنی مێژوویەکی دێرینن ؟!

ناتوانین چاو لەو ڕاستی یە بپۆشین کە ژمارەیەك لە کوردەکان بەشداریان لە کوشتاری ئەرمەنیەکاندا کردوە ، بەڵام ( ڕاستی یەکی ڕوونی ) تریش هەیە کە ئەو کوردانە کەمن ئەو کردەوانەش لەوانەوە دوورنین ، بەڵام وەرن تەماشای دەوڵەتێکی گەورە بکەن کە لێپرسراوی ئیشو کاری ولاتێك بێ‌و دەسەلاتی دینو دونیای بۆخۆی زەوت کردبێ ، شورەیی نیە بۆ ئەو دەوڵەتە ئوتوکراتیو ستەمکارە سەربرینو قەسابخانەی ئەرمەنیەکان بکات بە شتێکی ئاساییو نەك هەر ئەمەش بەڵکو بە ئەرکێکی پیرۆزی دابنێت !! لە کۆمەڵگایەکی خێلەکی دواکەوتوودا کە زۆربەی کوێرو نەخوێندەوار بێت فەرمانێکی ڕەسمی وەها چۆن ئەنجام ئەدرێتو هەموو شتێك چۆن ئاسایی نابێت ؟!

ئەگەر هێزەکانی پۆلیسی لە شارێکی گەورەی ئەورووپادا بکشێتەوە ، ئایا دەها رووداوی دڵتەزین کە هەرگیز بە تەمای نین ڕوو نادات ؟!

( خۆزگە هەموو شازادەیەکی میللەتی کورد ، مەسەلەکەی ئەوەندە ڕاستگو بووتایە ـ وەرگێڕەکان ) ئەوەی لەم دواییەدا لە (لیڤرپول)[٨٥] ڕوویدا گەواهێکی زرتو زیندووی منەو هەتا ئێستایش مەهەکی ئەو ڕووداوانە لە بیرەوەری کۆمەڵگای بەریتانیدا هەرماوەو پەل نەدات، ئەوە لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووی شارستانیدا !! ئیدی بۆ لۆمەی چەند کەسێکی کورد بکرێت کە بەشداری یان لە ڕووداوانەدا کردووە ، گەلێکیش لەوانەیە بە بیانووی[٨٦] پڕوپووچ هەڵیان ناوون بو بەشداری بوون ؟! لە دواییدا دەرکەوت ئەوانەی کە تێکەڵاو بوون لەو کوشتارانەدا شاری بوونو بە هۆی زیانی دوورو درێژیان لەگەڵ تورکانا هەموو خوو رەفتارێکی بۆگەنی ئەفەندی یەکانی ئەستەموولیان گرتبوو ، ئەو کوردانەی کە بەشداربوون لە چەوسانەوەی ئەرمەنی یەکان ، لە دێرزەمانەوە بەنج کراوونو هەست ناکەن کە کوردنو دەماری نەتەوایەتیان خەساوە لە لیتەی یاخیبوونی کەمالیەکانو کۆمەڵی ئیتحادو تەررەقیدا هەتا لێویان نووقم بوون ، ئەگەر رۆژێك لەرۆژان بیر لەوە بکرێتەوە کە بەرزەوەندی ئەم ( کوردە تورکانە ) تۆزێك بلەقێتو ڕادەیەك دابنرێت بۆ ئازارو تالانی ئەو خەڵکە کەساسە ئەوان شێتگیر دەبن ، تورکەکان تەنها ئەو نموونە لکراوو قێزەونانە دەخەنە پێش چاوی ئەرپیدە ئەورووپایی یەکان بۆ ئەوەی بە چاوێکی سووکو خراپ تەماشای کوردەکان بکرێت ، تورکەکانو ئەرمەنی یەکان دوژمنایەتی کوردەکان دەکەن ، چونکە ئەگەر دان بنرێت بەوەدا کە کورد میللەتێکە لافو گەزافیان دەرئەکەوێت کە گوایا هەر خۆیان لەمەو

پێش‌و ئێستایش گەورەی وولاتن ، لەو بڕوایەدان کە تەنها تورك‌و ئەرمەن هاوزۆران‌و هاودژمنی یەکن لەمەیدان‌دا هەردوکیان هیوادارو بەرچاو روون بەسەرکەوتنی نزیك ، چۆن ؟ ئەرمەنیەکان بە بەزەیی‌و پشتگیری ئەوروپای‌یەکان پشت ئەستوربوون ، تورکەکانیش بەوە پشتەستوربوون کە زۆربەی زۆری ولات موسلمانەو سۆزی ئاینی‌یان زۆر بەهێزە ، تورکیش‌و ئەرمەنیش بە گاڵتەو قەشمەری‌یەو ، گرەویان لەسەر کورد دەکرد ، تورکەکان تەماشای کوردیان ئەکرد کە مرۆڤێکی موسلمانەو ئاینی خۆی لە هەمووشتێك خۆشتر دەوێت ، گەلێك ڕێزی خەلیفەیان لەلایەو بەو چاوە تەماشای دەکەن کە لەسەر زەوی سێبەری یەزدانە ، ئەرمەنی‌یەکانیش بەو چاوە تەماشای کورد ئەکەن کە لە باغەوە عیسایی‌ن و ئێستەیش دڵیان بۆ ئەوە لێئەدا کە بگەڕێنەوە سەر ئاینە دێرینەکەی خۆیان ، ڕایان وەهابوو لەگەڵ کوردەکان‌دا بە گشتی‌ی ئەتوانرێت زۆر بە بەختیاری‌و ئاسایش پێکەوە بژین ، بە هەرجێك دەسەلاتی پڕ ستەمی تورك لەم ولاتەدا نەمێنێ‌و دەزگاو بوو کانیان لێبچرێت کوردیش کە هەردوولا دانی لێ ئەکرۆژن پێویستە بچێتە کۆڕەوە ، بۆ هەردوولای ڕوون بکاتەوە کە بە ژمارەش‌بێت ـ بەلای کەمەوە ـ ( بەرە )ی توخمێکی بەهێزو پێز ترە لەم ولاتەدا ( مەبەست تورکیایە ) ، وە کورد هەرچۆنێك بووە ئەو میللەتە بەهێزو ڕەسەنەیە کە لەگەڵ هەردولادا ململانێ‌ی خۆی دەکاو درێژەشی پێ‌ئەدات ، ئەرمەنی‌و تورکیش پڕ بەپڕ وەك سەگ وەهان هەمیشە ئامادەن بەك بگرن‌و ئەلەکۆمەکێ بکەن‌و بگرە دەچنە پال هەموو هێزێك ـ بۆ ماوەیەکیش بووە ـ بۆ ئەوەی ناوبژی‌کەری هەردوکیان کە گەلی کوردە لەت‌و پەتی بکەن ، تورك‌و ئەرمەنی بەجوتە پڕ بەدەم هاوار ئەکەن کە

کوردەکان لە ڕاستی‌دا ڕێکخەری کوشتاری ئەرمەنی‌یەکانی ، تورکەکان بەرتیلێکی باشیان بە «پیلوت»ی[٨٧] هەرەنسی‌دا بۆ ئەوەی نامیلکەیەکی چووك لە پاریس دەربکات بەو نیازەی کە شۆرەتو ناوی کوردەکان لەکەدار بکات ، وە تورك تانوپۆ لە کوشتاری ئەرمەنی‌یەکان بێ‌خەبەر بکات ، گوایا کوردە جانەوەرە کێوی‌یەکان هەڵساون بەو کوشتارە !!

* * *

شوێنێك لامان دایە تیلمانو بووینە میوانی بەکر ئەفەندی خاوەن دێ ، ئەم پیاوە کوردە لە شار دادەنیشێت ئەم دێیە یەجگار بە پیتو قەشەنگو رازاوەیە ، کەچی ئەوەندە بە پارە یەکی کەم « ئیجارە » کراوە ڕووت نیە باسی بکەیت ، جوتیارە تورکەکان (٣٥٠) قروشی کاغەز ئەدەن لە جیاتی هەموو جوتێك ، بەڵام لەوە دڵنیاکراوم کە بەکر ئەفەندی زیانێکی زۆری کردووە لە ئیجارەی دێ‌دا ، لە ئەنجامی پرسکردنێکی خەستو خۆڵ‌دا ئەمەشم بۆ روون بۆتەوە کە بەکر ئەفەندی لەگەڵ هەندێك تێکەزاو دۆستە دەوڵەتدارەکانی لەناوچەکەدا دەستیان کردووە بەیەکداو گەنمو ترچەشکاری دێکەی بە دزی‌یەوە گوێزراوەتە دێکانی دراوسێی . لە ئەنجامی پشکنینو توێژینەوەی یاسای داهاتە کشتوکاڵیەکاندا ، لەوە گەیشتم کە بەکر ئەفەندی‌و چینەکەی ( نموونەی کوردە عوسمانی‌یەکان ) باشترین ڕێگەیان گرتووە ـ ئیتر بەهەر شێوەیەك بووە ـ بۆ ماشینەوەی فازانجو سوو سەلەم‌کردن تەنها چینەکەی بەکر ئەفەندی‌و دەستوپێوەندەکانی توقیون لە هەرەس هێنانی دەسەڵاتی عوسمانی ..

زۆر بە دەگمەن هەڵئەکەوێت ـ وەك ئەم دێیە ـ جوتیارەکان گرێی زەوی بدەن بە دەوڵەت ، لە کاتێکدا دوو کەڵە پیاوی

ناوداری دەولەتیش گەزاف لێ ئەدەن کە مولکی ئەوانەو ماوەیەکی دوورو درێژە کێشەو هەرایانە لەسەری ، هەموو سالێکیش لە مەزاتی بەکرێ گرتن یا دەست دەکەن بە زەمزەم کاریی لەسەر یەکدی هەتا دەگاتە پادەیەکی وەها کە دووئەوەندە نرخی بەرز دەکرایەوە .

# [ ١٩ـی ئەیلول ]

والی دوو رۆژ لەمەوپێش لێرەوە رۆیشت بۆ حەلەب ، منیش بە پەلە کەوتمە رێ بۆ ئەوەی لە ئێستگەی شەمەندەفەری عەرەب پونار ) بەیەك بگەین و پێکەوە برۆین ، چەند کاژێرێك لەوێ ماینەوە ، ئەم ئێستگەیە کەوتۆتە سەر هێلی ئاسنینی بەغداد .

کاپتن ( ئەلیفنستون )ی ئینگلیزی لێرەدا بۆ ماوەیەك خێمەی هەلداوەو نیشتەجێ بووە ، لەگەل عەشایەرەکانی هاوسێدا پەیوەندی پتەوی بەستوە ، ئەو عەشایەرانە هەمویان کورد بوون ، ئەم ئەفسەرە بارو دۆخی ناوچەو هەندێ بەسەرهاتی بۆ گێرامەوە لە بارەی حەشار و دالدەدانی خێزانە ئەرمەنیەکان کە لە کوشتار خۆیان رزگار کردبوو ، جوامێری و مرۆڤایەتی کوردەکان لەو بارەیەوە گەیشتە گەشکەشانی ئاسمان ، لەڕاستیشدا ئەو ئەفسەرە لەم ناوچەیەدا ئەوە دلنیای کردبوو کە بە چاوی خۆی ئەو خێزانەی دیبوو کە چۆن سامانداریکی کورد لە کوشتار رزگاری کردبوو . وە ئەندامەکانی ئەو خێزانەیش بە جۆرێك موچاندبوو ( تبنی )کە هۆگری خەلکی ناوچەکە بووبوون ، نەیاندەویست جێی بهێلن ، کاپتن (ئەلیفنسون) بەچاوی خۆی دیبوی کە ئەو خێزانەخانەدان کوردە ئاشێکی گەورەی بەخشی بوو بەو خێزانە ئەرمەنیە ، ئەندامەکانی ئەو خێزانە ئەرمەنیە لە کاپتانیان گەیاندبوو کە باری ژیانیان زۆر

خۆشەو لە هیچیان کەم نی‌یە ، لەلای خەڵکی دێیەکەیش زۆر خۆشەویست‌و ڕێزلێگیراون ، بەڵام ژیانە ئاسودەیەیان زۆری نەخایاند، هەندێك لە سەرکردەی ( پروپاگندەچیەکان )ی ئەرمەنی هاتنە لای ئەو خێزانەو کەوتنە بن کللێشەیان‌و لە خشتەیان بردن ، هەڵیاندان کە ئیشەکەیان‌و ناوچەکە بەجێ بهێڵن ، وە بە تێزەدانی کیانی دوژمنایەتی لەگەڵ کوردەکاندا وەهایان کرد لەو خێزانە کە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکاندا نەهێڵن‌و ئەرمەنی‌یە چاوچنۆکەکەش بڕیاریدا کە ئاشەکە بەجێ‌بهێڵن‌و بۆ خۆی ئیش بکات ، ( پروپاگەندە چی‌یەکانی ) ئەرمەنی وایان خستبووە مێشکی کە ئەگەر بڕوات بۆ حەلەب‌و یارمەتی لە ئەرمەیکی‌یەکان وەربگرێت گەلێك بۆئەو قازانجترە ، بەڵام پاش ماوەیەك درۆو ساختەیان کەوتە ڕوو ، هیچ هیوایەکی ئەو خێزانە داماوە نەهاتەدی ، بەشێوەیەکی زۆر تاڵ پەشیمان بوونەوە ، بە ئاواتی ئەو ڕۆژانەوەبوون کە لە ناوچەی کوردستانی ڕەنگین‌و گەلی کوردی بەوەفادا دەژیان ، ڕۆڵەی نەتەوەی خۆیان دەستی لەبن دابڕین‌و لە هەردوولای کردن ، ئەوەبوو ئەو خێزانە ئەرمەنی‌یە هاتەوە بۆلای کوردە خانەدانەکەو داوایان لێ‌کرد کە بچنەوە سەر ئانەکەی خۆیان، بەڵام ئەمیش هۆشیارانە داواکەی پەرچدانەوە چونکە پیاوی سپڵە دەبێ پاداشتی وەهابێت !!

## [ ٢١ـی ئەیلول ]

**لە حەلەب :**

خاتو بێلی خێزانی کۆلۆنێل بێلی ئەفسەری سیاسی گشتی‌ی ئینگلیز لەحەلەب تازە لە قەزای بۆستان گەڕابوۆوە دوای ئەوەی بە هەندێك ناوچەی کوردستانا گەشتی کردبوو ، سەریشی لە خێڵە

کوردەکانی ئاتەمی‌و سینامیللی‌یەکان دابوو ، ئەو خێلانەی کە لە ماوەی ۲۰ تا ۳۰ ئابی‌ڕاپوردوودا چوومە ناویان ، خانو بێل پەیوەندی‌یەکی بتەوی لەگەڵ ئافرەتە هاوتوخمەکان خۆیدا بەستبو ، گەلێك لەو پەیوەندی‌یانەی سوودی لێ‌دەبینرا ، جگە لەوەی کە پڕبوون لە ڕابواردن‌و پێکەنین • ئەوەی کە سەرنجی خانو بێلی ڕاکێشابوو ـ وەك خۆی بۆ منی گێڕایەوە ـ ئەوەبوو کە کوردەکان هەستێکی ڕیشەداری دوژمنایەتیان لەگەڵ تورکەکاندا هەیە • ئەمە نموویەکی زەقی بەهێزە کە ئافرەتی کورد[۸۸] بەتایبەتی کابانەکان ـ ئامادەن لەگەڵ مێردەکانیاندا بەبێ عەباو پەچە چاویان بە کۆمەڵێ لە ئەمریکی‌یەکان بکەوێت کە لەگەڵ خانوو بێل هاتبوون ، بەڵام هەرگیز ئامادەنین لەگەڵ تورکاندا ئەوە بکەن •

راپۆرتێك لەبابەت خێڵی کوردی ڕەشوانەوە

ئەم خێڵە لەو شاخانەدا دەژین کە کەوتەتە باشووری مالاتیاوە •

ڕاپورتی سەرژمێری :ـ ۴۰۰۰ تا ۴۵۰۰ خێزانێکن‌و بەم شێوەی خوارەوە دەژین ؛

خشتەی ژمارە یەك (۱)

| قەزا | ژمارەی دێ | ژمارەی خێزانەکان |
|---|---|---|
| ۱ ـ کیاختە | ۹٤ | ۲۰۳۰ |
| ۲ ـ حوسنی مەنسور | ۱۷ | ۱٤۱۷ «۲۰۰ـ٤۰۰» خێزانیان گەرمیان‌و کوێستان ئەکەن‌و دێیان نی‌یە • |
| ۳ ـ مالاتیا | ۱۲ | ٤۵۵ |

| ٤ ـ بهیسین | صفر | ۱۸۰ خێلە ڕەوەندەکان خانووی کاتی دەکەن‌و بە پەوی سەری دەگـرن ٠ |
|---|---|---|

ئـەم خشتەیەی خوارەوەش دابەش‌کردنی خێلەکەمـان پیشـان ئـەدات کـە رەوەندین ٠

لـە ۱۰٪ ـ ی ئەو خێلانەی خشتەی ژمارە «۲» تەواون‌و بە درێژای ساڵ دەوارنشینن وە لـە ٦٥٪ یـان بـە زستان لـە خانوودا ئـەژین‌و بـە هاوین لـە دەواردا ، لـە ۲٥٪ یـان لـە دێهاتەکاندا نیشـتەجێن ، تەنها خێلی ژمـارە ۸ ، ۹ وە نیوەی خێلی ژمـارە ۱۱ شیعەن‌و ئـەوانی تر هەموو سـوننی مـەزهەبن ٠

**ئـەنجامـەکانی جـەنگ :**

بەپێی ئەو ژمـارانەی کە لەسەر خێلە کوردەکانم وەرگرتووە ، بـە تێکرا ماڵـەکان لـە ۳٥٪ کەمی کردووە ، کوردەکان بەو چاوە تـەمـاشا دەکرێن کـە یـەك خێزانن یاخو یـەك (وحدە)یەکن دەتوانن خـۆبەخۆ بژین‌و یەکدی بپارێزن ٠ خێزانیش کـە پیـاوەکەی نەما بە ژن‌و منالـەکەی نـاترێت (یەکە)یەکی دانیشتوان ، بەو هۆیەوە دەتوانین بڵێین کە لە ۱٥٪ی خێزانە ڕەوەندەکان بنەبڕ بـوون ٠ وە لـە ۲۰٪ یـان بوونەتە خـۆراکـی برسیەتی‌و تەروە نـەبوون ٠ بێ‌گومان لەبارو دۆخێکی وەهادا گەلێـك لەو خێزانـانە لـەبۆتەی خێزانەکانی تردا دەتوێنەوە ٠ ئەو خێزانـانەی سـەر دەرئەکەن لـە وەیشورمەی جەنگ‌دا لـە ئەنجامدا خۆیـان دەگـرنـەوەو دەبنـەوە بـە خێزانە تۆکمەکەی جاران ٠ بـەشێوەیەکی گشتی‌ی ئەتوانین بڵێین کە تێکرا ٠

دانیشتوان بەهۆی جەنگەوە کەم بوونەتەوە ، کوردەکان خۆیان دەڵێن یەکێ لە هۆی سەرەکی ئەو کەمبوونەوەیە بەڵای ئەوانەوە ئەمەیە کە ئەوانەی کوڕیان لە ڕیزی سوپاوە هەڵهاتوون ماڵیان سووتاندوون ، جگە لە قاتەو گرانیو نەخۆشی ئەنفلونزاش ، حوکومەتی تورکی پتر لە (٢٥٠٠) ئەسپو هێستر وە (٢٥٠٠) سەر مەڕو بزنو (٦٠) هوشتر ، (١٠٠) ڕەشە وڵاخی ئەم خێڵە قەرزارە .

**خاسیەتە گشتیەکان :**

ڕۆڵەکانی ئەم عەشرەتە هەتا بڵێی ڕەوشت بەرزو میوانپەرستو دڵپاکن وە بەمانەش ناویان دەرکردووە .

**ئـاین :**

عەشرەتی ڕەشوان جگە لە بەشی ، خدرە سوور ،و نیوەی بەشی (بۆلام) نەبێت هەموو سوننی مەزهەبن ، شیعەکانیان بەشێکی کەمن و ژنو ژنخوازی لە ناویاندا کەمە .

**کەلوپەل پۆشـاکی :**

شاڵو کراسی کراوەو ئالو والا لەبەردەکەن چاکەتەکانیان (تەقاڵە)ی پێئەوترێو بە تاڵی سوور دەچنرێت ، کڵاو (فیست)ی سەریشیان زبرەو پێی ئەوترێت (کوڵك) یاخۆ (هوم) ، عەبای چیتی سووریش دەپۆشن .

**زمـــان :**

لەهجەکەیان کرمانجیە ( بڕوانە ئەو تێبینیانەی کە لە بارەی عەشرەتی ئانمی کوردەوە نوسراون ) زۆربەی کاربەدەستان کوردو خەڵکی ئەو دێهاتانەی کە دەکەونە سەرەڕێی شارەکانی تورك

ـ تورکی‌یان بە پوختی دەزانی ، بەڵام لە جەرگەی لادێ کوردەکاندا کەم‌کەس تورکی دەزانێ •

**چەند هەنگاوێك بەرەو دوا :**

سێ تا چوار سەدە لەمەوپێش عەشرەتی ڕەشوان یەکێك بووە لەو عەشرەتە ڕەوەندانەی کە زستان لە بهێسنی‌دا دەمانەوەو لەسەرەتای هاوینیشدا ڕەویان دەکرد بۆ ( ئەنقەرە ) ، ساڵی لە ساڵانی دێرین لە لایەن تورکانەوە هێرش برایە سەر ئەم عەشرەتە ، لە ئەنجامی ئەو هێرشەوە سنورێك دانرا بۆ بەزین‌و مانەوەیان لە هاوینەهەواری لادێ‌کانی ئەنقەرەدا ، بەشێکی کەمیشیان لە ناوچەی ( دەشت هێمن ) دائەنیشتن وە هەتا ئەمڕۆیش هەر لەوێ ماونەتەوە • بەشە زۆرەکەی دیکەی ئەم عەشرەتە گەڕاونەتەوە بەرەو « باشوور »و لە ناوچەی شاخەکانی نێوان دەشتی بهێسنی‌و مالاتیادا دێهاتیان ئاوەدان کردۆتەوە ، بەشێکی دیکەی ئەم عەشرەتە لە دەوری « کیلیس » دائەنیشن ، وەك دەڵێن (کولین) کە ئێستە بەشێکە لەعەشرەتی (جلالی)و[٨٩] لەسەر سنووری ئێران دائەنیشن • بەشێکی لە عەشرەتی رەشوان‌و تەروەنە بوون •

**هەڵوێستی سیاسی و سەربازی :ـ**

ئەم عەشرەتە بە ئازایەتی‌و جەنگاوەری ناوبانگیان دەرکردووە ، نزیکەی ١٠٠٠ هەزار تفەنگیکی تازەو ٢٠٠ فیشەکدانی تفەنگیان هەیە ، ئەم عەشرەتە هەمیشە ئامادەیەو دەتوانێت ٢٠٠٠ دو هەزار کەس بخاتە ژێر چەك ، دوو هەزار سەربازیش ـ ی بە حوکومەتی تورکیا داوە بۆ کوڕی جەنگ ، بەڵام هەزار سەربازێکیان لە جەنگ خۆیان

حەشارداوەو ڕاپیان کردووە ، هەتا ئێستا کە ساڵی (١٩١٩) ەیە ١٠٠
لە هەزارەکەی دیکە بەسەلامەتی لەجەنگ گەڕاونەتەوە لەچەند
هێرشێکی تەمیکاری حوکومەت زۆربەی ماڵە سەربازە هەڵاتووەکان
سوتێنراون ، ئەم کردەوەیە بووەتە هۆی جۆشانی هەستی ڕق‌و کینە
دژ بە تورك‌و دەوڵەتەکەی .

**سەرۆکەکانی ئەم عەشرەتە :-**

حاجی بەدر ئاغا :- پیاوێکی باڵا بەرزی ڕوو خۆشە ، تەمەنی نزیکەی
٤٥ ساڵە ، هەتا بڵێی دڵپاك‌و خۆش‌مەشرەف‌و قسە لەڕووە .
دەسەڵات‌و ڕێزێکی زۆری هەیە لەناو ڕۆڵەکانی عەشرەتەکەیا ، لەلای
دەسەلاتدارانی دەولەتی تورکیاشەوە دڵی ڕائە گیرێ‌و خۆشەویستە،چونکە
هەوڵ ئەدات لەگەڵ حوکومەتیشا پەیوەندی‌یەکانی باش‌بێت ، هەرچەند
ماوەیەك لەمەوپێش بۆ چەند مانگێك گیراو لە بەندیخانە توند کرا
ئەو گرتنەش لە ئەنجامی ئەوەدابوو کە ژمارەیەکی زۆر لە
سەربازەکانی عەشرەتەکەی هەڵهاتبوون . حاجی لەوەیش داکۆکی دەکرد
کە نابێت بدرێنەوە بە دەست حوکومەتەوە . براکانی :- زەینەل بەگ :
بە لەش کەتەو قەبەیە بەڵام دەستەلاتێکی وەهای لەناو عەشرەتەکەیانی‌یەوە
**حەیدەر بەگ :**
گەنجێکی قووچی فیز زلە .

**سەنگ‌و پێوانەکان :**

قیرات دەکاتە ٦ کیلۆ .
٣٢ قیرات دەکاتە کێل وە دەکاتە ١٩٢ کیلو غرام .

پارەو دراو :

لیرەیەك بە ٧ مەجیدی‌یە ، مەجیدی‌یەك بە ٢٠ قروشە ٠ لیرەیەکی کاغەز بە ٣٥ قروشە ، جزدانێك بە ٥ لیرەی کاغەزە ٠

نرخی شتومەك :

گەنم قیراتێکی بە ١٠ قروشە واتا تەنێکی مەتری بە ٨٣ مەجیدی‌یە ٠

جۆ : قیراتێکی بە ٦ قروشە ، واتا تەنێکی مەتری بە ٥٠ مەجیدی یە ٠

کاوڕ : کاوڕێکی یەکساڵە بە ١٣ تا ١٥ مەجیدی‌یە ، کاوڕێکی دووساڵان بە ١٥ تا ١٧ مەجیدی‌یە ٠

گیسك : گیسکی یەکساڵە بە ٩ مەجیدی‌یە ، بەڵام دووساڵان بە ١٠ مەجیدی‌یە ٠

ڕۆن :

حۆقەی ئەستەموول بە ٢٠ قروشە ٠

خوری :

حۆقەی بە ١٢ قروشە ٠

مووی بزن :

حۆقەی بە ١٢ قروشە ٠

باری کشت‌وکاڵ : بەرووبومی کشتووکاڵ بریتیە لە گەنم ، جۆ ، هەرزن، توتن ، لۆکە ، لە شاخەکانیشدا هەرزنە کێویلەیش کۆدەکرێتەوە ، زەوی‌یەکانی دەشت قەڵای (حوسنی مەنسور) بە پیترین‌و باشترین زەوی لە چاندنی دانەوێلە ( ووشکەدان )دا یەکوبیست‌و یەکوسی دەبرێت ،

لە ناوچەی بهێسینن‌دا یەك‌وپازدەو یەك‌وبیست‌وپێنج دەی‌بڕێت •

لە ناوچە شاخاوی یەکانی ( کیاختا )دا یەك‌ودەو یەك‌وحەوت دەی‌بڕێت هێش‌و گاسن جووتەگا دەی‌گێڕێت • لە ناوچەی شاخاوی‌دا جووتێك لە رۆژێکا ۲ مەن (٤٠٠) کیلۆ تۆو دەکات • بەڵام لە دەشتا ۸۰۰ کیلۆ تۆو دەکات ، لەلایەکی تریشەوە ڕەزەدێم‌و خای‌تریّ بە چڕی هەموو لایەکی داپۆشیوە •

## بەخێوکردنی مەڕو مالات ( ئاژەڵ داری ) :

زینەماڵی ئەم عەشرەتە زیاتر لە نیوەی بەهۆی جەنگەوە لەناوچوون ، خێزانێك کە باری ژیانی خۆش‌بێت بەلایەنی کەمەوە ۱۰۰ سەرێك ئاژەڵی هەیە ، لە دەشتا مەڕی چاو ڕەش لە ۷۰٪ی ئاژەڵە بەڵام لە ناوچە شاخاویەکاندا نە ۹۰٪ی ئاژەڵ ڕەشە بزنە ، بزنێك لە ناوچە دەشتەکاندا بە سالێك ئەوپەڕی سێ هۆقە کەرەی پالفتە ئەدات •

## بەرهەمە سروشتیەکان :

دیارترین ئەو بەرهەمانە درەختی مازووە ، خێزانە هەژارەکان لە درەختی ( جادو ) کەتیرەو گەوەن کۆ دەکەنەوە و لە قەزای حوسنی مەنسور دەی‌فرۆشن‌و هۆقەی بە (٥) قروشە • گیای (قمع)یش، کە لێرە پێ‌ی ئەڵێن «گومی» بۆ سووتەمەنی بەکاری‌دێنن •

## دارستانەکان :

لاپالای شاخەکان ڕووتەنن بەڵام دارو دەوەنی بەڕوو ، عەرعەر ،

لیره مەرخی پێدەڵێن لەم نـاوچەیەدا بەبـاشی ئەرۆێن و سەرهەڵدەدەن ، بەلام لەمەوپێش شاخەکان بـە درەختی عەرعەر داپۆشرابوون •

**کـانـەکـان :**

خـەڵـووز لەدێی (کارێز) کـە نزیکە لە (کیاختە)وە بـە هەڵکەندن دەرئەهێنراو خێڵەکانیش وەك سووتەمە نی بەکاری دەهێنن ، لـە ناحیەی سنجقی سەر بە قەزای کیاختەوە لـە نزیك دێی (رودکا)دا کانی یەکی شیری هەیە بـەردەکانی نێو تەختی جۆگەکەی سوور کردووە کـەچی بـەردی ئەملاولاکەی کریستال ئاسا سپی یە ، خەڵکی ناوچەکە ئاوی ئـەم کانی یە بۆ (ڕەوان)بوون بەکاریان دەهێنا ، کانی خوێ لـەم نـاوچـەیـەدا نی یـە •

دەستڕەنگینی و بازرگانی : ژنانی ئەم نـاوچەیە دەستڕەنگین و سەنعەت سازن ، تەون کاری ، فەرش و بەڕەو جاجم و گۆرەوی یـان لـە خـوری و دەواریـان لـە مووی بزن دروست ئەکرد ، دێنشـینەکان ڕەنگـەکانـی (ئەنایلین)یان لـە شار ئـەکڕی ، بـەلام ڕەنگی سـوورو ڕەش خۆیـان دروستیان ئەکرد ، ڕەنگی ڕەشیان لـەبەردی (بویاغات) دەرئەهێنا[٩٠] ، ڕەنگی سووریش لە سپیچنارو توێکڵە گوێز ئەهاتە بەرهەم ، لەم ناوچەیەدا ئـاسـنگەرو نـاڵبـەند زۆرە ئـەم خێڵـە هێسترێکی زۆریـان هـەبوە و لاخداری یان کردووە[٩١] •

**دۆخـی ئـابـووری :**

دێهاتـە نـاوچە شاخاوی یەکان بـە ئاژەڵداری دەژین و دێمەکاری یان

زۆرکەمە ، بەلاّم دەشتەکان بە پێچەوانەوە بەرهەمێکی فراوانی ووشەکەدان‌و ئاژەڵداری‌یەکی کەم •

**یاسای موڵکایەتی زەوی‌و دەرەبەگایەتی :**

دێ‌نشینەکان لە پێدەشتا زۆربەیان وولاّخی جووت‌و تۆویان هەیە ، ئەمانە پێان دەوترێ (خوی‌جوت) یاخۆ (ئەرزی) لە دەشتەکاندا زۆربەی دانیشتوان (نیوەکار)ن واتا هاوبەشن لەگەڵ خەڵکی ترا کە ئەوانیش خاوەنی سەرمایەو هۆی بەرهەم‌هێنان‌و (هێش) ، گاسن ، ولاخی جووت ـ تۆویش لەسەر خۆیانە •

**باری تەندروستی :**

نەخۆشی ئەفلەونزای ئەسپانی لێرە زۆرە بەلاّم نەخۆشی سناری‌و درم لەم کاتەدا[٩٢] بلاّونەبوەتەوە • دانیشتوانی دامێنی بهێسینی بنە دەست لەرزوتاوە دەناڵێنن • باری تەندروستی لەم ناوچەیەدا بەگشتی‌ی باشەو دێنشینەکانی تۆکمەو لەش‌ساغن •

**شوێنەوارە دێرینەکان :ـ**

٣ میل لەولای کیاختەوە پردێکی دێرینی رۆمانی هەیە ، لە دۆخێکی قەشەنگ‌و باشدا ماوەتەوە ، لە کیاختە خۆیدا گەلێ بەردە نووسمان بەرچاو کەوت ، جگە لەهەندێ شوێنەواری تر کە دەگەڕێنەوە بۆ کاتی (حیسیەکان)[٩٣] •

**شکارو گاڵتەوگەپ :**

لە ناوچەی (چیاسپی) و [ نمرود داغدا ] کەلە کێوی زۆرە ، سەرۆک خێڵەکان شەیدای ڕاووشکارن‌و فڕان فڕانی هەڵۆ ، وا دیارە کەو کە بالندەیەکی کێوی‌یە لەم ناوچەیە دەنگ‌و باسی نی‌یە •

**خشتەی ژمارە -٣-**

| ناوی دێ | ژمارەی ماڵەکان | |
|---|---|---|
| | لە پێش جەنگدا | لە دوای جەنگ (کەئێستەیە) |
| ١ - چات | ١٥ | ١٠ |
| ٢ - باخچە | ١٥ | ١٠ |
| ٣ - چنگل | ١٠ | ٨ |
| ٤ - تاوسی | ١٨ | ١٢ |
| ٥ - کوکشیر | ٣٠ | ٢٥ |
| ٦ - پوستن | ١٠ | ٥ |

| ناوی دێ | ژمارەی ماڵەکان/ناحیە سنجق | |
|---|---|---|
| | لە پێش جەنگدا | لە دوای جەنگ |
| ١ - سنجق | ؟ | ٦٠ |
| ٢ - کوشکونو | ؟ | ٨ |
| ٣ - میران | ؟ | ٢٠ |
| ٤ - لاکن | ٤٠ | ٣٠ |
| ٥ - پاملی | ٣٠ | ٢٠ |
| ٦ - هاجیك | ٢٥ | ١٨ |
| ٧ - ئومیك | ٧٠ | ٤٥ |
| ٨ - سەکز | ٢٥ | ١٥ |
| ٩ - زیفکیری | ؟ | ١٩ |
| ١٠- بیرمیشی | ؟ | ٢٠ |
| ١١- خویان | ؟ | ٨ |

## پاشماوەی ناحیــەی سنجق

| نــاوی دێ | ژمارەی ماڵەکان لە پێش جەنگ | ژمارەی ماڵەکان لە دوای جەنگ |
|---|---|---|
| ١٢ـ قەرقوشە | — | ٨ |
| ١٣ـ فریکان | — | ٧ |
| ١٤ـ شەمین بیان | — | ٧ |
| ١٥ـ شیفیرین | — | ٣٠ |
| ١٦ـ روتەکان | — | ٤٠ |
| ١٧ـ شەرەف خان | — | ٦٠ |
| ١٨ـ قوشەتوش ثانی | — | ٨ |
| ١٩ـ چاردیکان | — | ٣٥ |
| ٢٠ـ خـدران | — | ٥ |
| ٢١ـ رەجەب | — | ٤٠ |
| ٢٢ـ بیستەکان | — | ٢٠ |
| ٢٣ـ شاەڤیردی | — | ٨ |
| ٢٤ـ ئارنوت | — | ٤٠ |
| ٢٥ـ چوقان (جوکان) | — | ١٠ |
| ٢٦ـ میستان | — | ٥ |
| ٢٧ـ نـاروێ | — | ١٠ |
| ٢٨ـ کوران | — | ٥ |
| ٢٩ـ پولکان | — | ٣٥ |
| ٣٠ـ کالیك | — | ٣٥ |

| ناوی دێ | پێش جەنگ | دوای جەنگ |
| --- | --- | --- |
| | ژمارەی ماڵەکان | |
| ٣١ـ حسن جبو | — | ٣٥ |
| ٣٢ـ حسین جبور | — | ٥٠ |
| ناحیە ئالوت | | |
| ١ ـ کولێك | ١٣٠ | ٨ |
| ٢ ـ کای‌ڕەش | ٢٥ | ٢٠ |
| ٣ ـ ئالوت | ٤٠ | ٣٠ |
| ٤ ـ تەرپال | ١٥ | ٢٠ |
| ٥ ـ تەشکان | ١٠٠ | ٧٠ |
| ٦ ـ خام‌زین | ٣٥ | ١٨ |
| ٧ ـ جیرالق | ٨٠ | ٤٠ |
| ٨ ـ ئەکی‌میرزا | ١٨ | ١٠ |
| ٩ ـ زەیتون | ٢٥ | ١٥ |
| ١٠ـ بیرجیف | ٨٠ | ٤٠ |
| ١١ـ کیوکیلان | ٢٥ | ٨ |
| ١٢ـ سوسیان | ٦٠ | ٣٥ |
| ١٣ـ بیزرین | ٧٠ | ٣٥ |
| ١٤ـ ئەریکیت | ١٥ | ٥ |
| ١٥ـ حوریك | ٥٠ | ٢٥ |
| ١٦ـ شیبایە | ٣٠ | ١٠ |
| ١٧ـ تیسل | ١٥ | ٣ |

| ناوی دێ | ژمارەی ماڵەکان پێش جەنگ | دوای جەنگ |
|---|---|---|
| ١٨- سینوك | ١٠ | ٤ |
| ١٩- کارجافیران | ٣٠ | ١٠ |
| ٢٠- مامیحان | ١٠ | ١ |
| ٢١- ناهیك | ١٠ | ٢ |
| ٢٢- پیروت | ٣٠ | ١٠ |
| ٢٣- کالیان | ٤٠ | ٢٠ |
| ٢٤- خانیلان | ٨ | ٤ |
| ٢٥- کەرەچور | ٤٠ | ٢٠ |
| ٢٦- غەجیحان | ٤٠ | ٢٠ |
| ٢٧- کوزیلیك | ١٠ | ٥ |
| ٢٨- چیرچیان | ٨ | ٢ |
| ٢٩- حسن دیکین | ٢٠ | ٥ |
| ٣٠- بویوق‌بال | ٦٠ | ٣٠ |
| ٣١- بریمان | ١٠ | ٥ |
| ٣٢- کیترو | ٥ | ٥ |
| ٣٣- بیرڤیدول | ٤٠ | ٢٠ |
| ٣٤- کیلیسیك | ٥٠ | ٢٥ |
| ٣٥- ئەسکیران | ١٠ | ٥ |
| ٣٦- خوپاك | ٣٠ | ١٥ |
| ٣٧- بارسومیك | ٣٠ | ١٥ |

٦ ـ خەلیل بەگ :ـ پیرە پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و گاڵتەچیو ڕۆح سووکە ، سەری لە زۆر شتا دەرئەچێو بگرە خاوەن بەهرەیشە ، هەست بە لێپرسراوێو مەسئولیەت دەکات ، بەنەرمو نیانی لەگەڵ خێڵە کوردەکانا مامەڵە دەکات ، بەڵام تەنها لەوەدا لاوازە کە زۆر کارامەنیەو ئازایانە ناتوانێت بەرامبەر دیاردەکانی ژیان بڕیاری خۆی بدات، وە ڕاڕایەو توێتکە ما ڕێت لە سەر بیرو باوەڕێك ، « بنواڕە یومیات میجر نوئیل ایلـول ۱۹۱۹ » •

٧ ـ عبدالرحمن بەگ :ـ ١٥ ساڵێکی تەمەنی لە سوێسرە بردوتە سەر ، هەر لە وێش حەزی لە کچێك کردووە و هێناویەتی ، وەکو باسی دەکەن :ـ پیاوێکی زیرەكو کارامەیە ، سەرنجو ڕاکانی پێشکەوتن خوازانەیە ، لە کاتی ئاژاوەکانی نێوان تورکو گریکدا ، پاریزگاری « ئایدین » بووە ، زۆر بەزیرانە ، بۆ کپ کردنەوەی ئاژاوەکان هەنگاوی ناوە •

٨ ـ زوهەیر بەگ :ـ دەرە بەگێکی سامان دارەو لە دیمەشق دائەنیشێت ، لە ناو ڕۆڵە کانی میللەتەکەیدا پایەو شوێنێکی وەهای نیەو ئەشڵێن قەموورە •

٩ ـ کامیل بەگ :ـ لە کۆنەوە لەگەڵ ڕووسەکاندا تێکەڵە ، ئەوانیش لە ساڵی ۱۹۱۹ دا کردوویانە بە والی ئەرزەرووم ، دەتگو باسێکیشی هەیە کە لە سوپای ڕووسیدا وەك ئەفسەرێك ئشی کردووە ، ئەشڵێن کامیل بەگ ئێستا ـ ئەیلولی ۱۹۱۹ ـ لە تیفلیسە •

**کوڕەکانی ئەمین عالی بەدرخان :ـ**

أ ـ ثریا :ـ ڕۆژنامە نووسەو ئێستا لە میسرە ، جەنراڵ « دیدیس » گەلێ باسی ڕەوشت بەرزیو باشەی کردووە •

ب ـ حیکمەت :ـ لـە ولایەتی قونیە بەڕیوەبەرە •

ج ـ جلادت[125] :ـ یاریدەدەری سـەر نـووسـەری ڕۆژنامەی [سەربەستی][126] یە لە ئەستەموول • ئەم ڕۆژنامەیە ڕێبازێکی هاوسۆزی « متعاطف » بوو لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ، لە ئەنجامی مانەوەی دوورو درێژی لـە ئەستەموولو مەشق کردنی لەشی هەموو بریندارو تێکشکاو بوو ئـەم پیـاوە ڕەوشت بەرزەو دڵو دەروونی زۆر پاکە •

د ـ کامەران علی بدرخان :ـ

پـارێزەرەو کرمانجی[127] نازانێت • پیـاوێکی ژیـر و لـە سـەر خۆیە ، بەڵام هەتا ئێسـتاش خۆی نەگەیاندۆتـە ڕیـزی پێشـــەوەی بـەدرخانی یەکانی دیکە •

هـ ـ توفیق بەگ :ـ ماموستای زانستی دارستان شناسیە لـە میونیخ•

و ـ ســـافدار :ـ لـەگـەڵ باوکـیدا لـە ئـەستەموول دەژین

منالەکانی تایەربەگ •

أ ـ فایز بەگ :ـ لـە مەوپێش قائمقام بووە •

ب ـ ئاسەف بەگ :ـ مامۆستای زمانی فەرەنسییە لـە زانستگای دەولـەت لـە ئەستەموول •

ئەندامە دەرکەوتووەکانی تری بەدرخانی یەکان :

أ ـ حسین حەسەن پاشا « ٦٠ » :ـ لە زۆر پارێزگای عوسمانی یەکانا پارێزگار بووە •

ب ـ حسین عەونی :ـ پیاوێکی باڵابەرزی تمەو چـاوێلکـەیـەکی

پزیشکی لە چاودایە ، لە کۆلێجی جەنگی ئەستەموول مامۆستایە ، لە یەکەم دیداری ئەم پیاوەدا هەست بەسام و هەیبە تێك دەکەیت ، بەهرەو توانایەکی تایبەتیو کاریگەری هەیە ، لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتا بە برشتو کارایە ٠

ح ـ عبدالقادر :ـ برای حسین عونییەو « رائد » ە لە سوپای عوسمانیدا ٠

**د ـ عەقید بەدرخان بەگ :ـ**

برای عبدالرزاق بەگی بەدرخانییە ، کە لە موسڵ لە ساڵی «١٩١٩» دا تورکەکان دەرمان خواردیان کرد ، عەقید بەدرخان هەر لەوکاتەی کە خۆی ناسیوە ، لایەنی حکومەتی عوسمانی پەرنەداوە ، ژیانی ئاسوودەگیو ڕابواردنی بۆخۆی هەڵبژاردووە ، خۆی نەداوەتە ئاقاری تێکۆشانو ئاوارە بوون لە پێناوی بیرو باوەڕی نەتەوایەتی کوردا٠٠ لەکاتێکا ئەم خێزانە تێکۆشەوە تووشی گەلێ چورتمو نەهاتی هاتبون لەو پێناوەدا ، کەچی عەقید بەدرخان هەرگیز هاوسۆزییەکی نەبووە لەگەڵ جولانەوەی نەتەوایەتی کوردا ٠

# [ چەند تێبینییەك لە بارەی سەرژمێرەکانی حکومەتی تورکەوە ]

ئەرمەنییەکان لەو بڕوایەدان ، کە تۆمارەکانی دەولەتی تورکیا ، هەمیشە لە هەولو داکۆکانی ئەوەدان ، کە ژمارەی موسلمانەکان ئەوەند بەرزو بەتەوژم بێت ، کە فەلەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی ، وە بەتایبەتی ئەرمەنییەکان ، لە هیچ کوێوە دیار نەبن ، تورکەکان ئەگەر بیان

ویستایە دەست وەردەتە ژمارەی سەرژمێرەکان ، لە دووڕێگەوە ئەیاز توانی :ـ

أ ـ دەست تێوەردانو پۆخلە کردنو ساختەکردن لە تۆمارە ئەسڵی یەکانا .

ب ـ ئەو ئەنجامانەی کە لە بارەی سەرژمێرەکانەوە دەردەکەوێت ، بە ساختەو پۆخلەیی دەگەیەنرێت بە جەماوەر .

زۆر مەبەستم بوو ، کە بە ووردی لە سەرژمێرەکانی تورك بگەم ، بەو هیوایەی بگەمە ئەو ئەنجامەی کە ئایا تورکەکان ، ڕاستگۆن لەم ئاقارەداو هەتا چ ڕادەیەك ، ئەو ژمارانە ڕاستیو دیاردەکانی ژیان دەنوێنن؟ ئەگەر ڕاستی تۆماوە بنەڕەتی یەکان ، بدەینە بەر سەرنج ، بۆمان دەرئەکەوێت ، کە چۆن بۆ ئەنجامدانی پەنایان بردۆتە بەرکوێخای دێهاتەکان ، وە سەرژمێرەکانیان بەم شێوەیە تەواو کردووە :ـ تۆمار کردنی کورتەیەکی سەرژمێری لادێکان ، بەراوردکردنی ئەو پوختانە لەگەڵ تۆمارە گشتی یەکاندا ، ئەگەر جیاوازی یەك بهاتایەکایەوە کوێخای دێهاتەکان بانگ ئەکرانو جیاوازی یەکان دەخرانەوە ژێر پرس وڕا . پێش ئەوەی ئەم باسە زۆرتر قووڵ بکەمەوە ، وەهای بەباش دەزانم کە باسێکی یاسای تۆمار کردنی عوسمانی بکەم کەچۆن لە ساڵی ١٩٠٥ دا سەرژمێری ئەسڵی ئەنجامدراوە :ـ کاربەدەستانی لێپرسراو لەپاو ماڵو ولانو کاربەدەستانی هەموو قەزایەك لیژنەیەکیان دروست کردووە ، ئەو لیژنەیە چۆتە هەموو دێیەکی قەزاکە ، ناوی هاونیشتمانەکانو شێوەی پێکهاتنیانی تۆمار کردووە ، خانەکانی بەم شێوەیە بەش کراوە :ـ ڕەگەز ، تەمەن ، پلەوپایەی لە خێزانەکەدا .. ، هەموو کاربەدەستان لە

سەر ئەو ڕایەن ، کە پێویستە تۆمارەکان لە سەر تازەترین شێوە ڕێکبخرێت ، ڕێکخراوی سەر زمێری ، لە هەموو قەزایەکدا ئەو ئەرکەی لە سەر شانە سەرو مرێش لە کوێخاکان دووپات دەکرێتەوە، کە هەموو مردنو ژن هێنانو زاووزێیەك و خێزانێکی تازە بدەن بە لێرسراوانو پشتگوێ نەخرێن •

ئەنجامی سەرژمێرو پشکنینەکانم لەسێ قەزای ناوچەی مالاتیادا ، کردووە بە باشکۆیەکی سەرەکی ئەم ڕاپۆرتە ، وەك بۆیشم ڕوون بۆتەوە سەرژمێرە سەرەکییەکەی سالّی ١٩٠٥ ی تورکیا زۆر بە ووردیو کارامەیی خراوەتەئیش ، بەلّام خەوشو پەرپووتی تەنها لە پاراستنو موعامەلاتی تازە دایە کە پڕن لە پۆخلەوات ، ئەمە کارێکی وای کردووە دەست بخرێتە ناو تۆمارەکانو بشێوێنرێت ، هۆی سەرەکی ئەو خەوشو کەلێنانە ئەمەیە ، کە کاربەدەستانی تورکیا ، خۆیان لە خۆیاندا لاوازو بوودەلّە بوون ، هۆیەکی تریش ئەوە بووە کە کوردەکان ، لە سەر زمێرەکان تەرێزیان دەکرد ، تورکەکانیش تاڕادەیەك هەر تەرێزیان ئەکرد، چونکە ئەمانیش هەر لەوەدەترسان ، کە کوڕەکانیان بخەنە تۆمارەوەو ببرێن بۆ خزمەتی سەربازی • ئەوەیشمان لەیاد نەچێت کە ئەو دێ سەرژمێرکراوانە کەوتوونەتە قەزایەکەوە ، کە مەرکەزەکەی شارێکی گەورەو بەربلاوە ، دیارە شارێکی وا گەورە لە هەموو ڕوویەکەوە دەسەلّاتی دەلّەت گەمارۆی داوە ، خەلّکی ناوچەکە ئەوەیان بۆ دووپات کردمەوە کە ژمارەی دانیشتوانی ناوچە شاخاویو خێلّە کوردەکان ، ئەوەندە ناساوەو دەست خراوەتە بینی ، بە ئاسانی دەگاتە ڕێژەی لە ٤٠٪ منیش لە ئەنجامی پشکنین و پرس و ڕاکردنمدا ، گەیشوومەتە هەمان دلّنیایی ، بەلّام بۆ ژمارەی دانیشتوانی دێ نارەوەندەکان ، یاخۆ ژمارەی

ئەو ناوچانەی دەمێکە ئەومەدان کراون و پرش و بڵاوترین باشترن ، ڕێـژەی پەڕپووتی و درشت سەرژمێرەکان لـە (٥٪) ە ، لـەوەش دنیـام کـە لـە ناوچەکەوا هەندێ دێهاتی ئەرمـەنی هەیە ، بەڵگەی تێرو تـەسـەلیشـم هەیە کە تومار کردنی ئەرمەنی یەکانیش لـە بارەی ووردی و درشتی یەوە ، لەگەڵ موسڵمانەکاندا لەتای ترازوویەکـدان ، تورکـەکان لـەو بڕوایـەدا بوون ، کە ژمارەی فەڵـەکان زۆر بە ووردی و پوختەیی ئەنجام دراوە ، ئەوەیش شتێکی زۆر ڕاستە چونکە بە پێی ئـەو سـەرژمێرانە بـاج و زەریبەی « سەربازی نەکردن » لە فەڵەکان ئەسەنرا ، ئەو باجانە جێگەیەکی باشی ئەگرت بۆ خەزینە نەخۆشەکەی دەوڵەتی عوسمانی ، بۆ نەگبەتـی سەپانیان بە سەرما[١٢٨] کە مالاتیا جێ بهێڵم ، ئـەم پـەرژا بچمـە بنج و بنەوانی دێهاتە ئەرمەنی یەکان و بگەمە ئەو ئەنجامانەی کە خۆم دەمویست ، لەگەڵ ئەمەیشدا تۆماری ئەرمەنی یەکانم پەڕە پـەڕەکرد ، بۆم دەرکەوت کـە بـە هەمان شێوەی دێهاتـە موسڵمانەکان ڕێکخراوە ، منیش بۆ مێژوو پاشـە ڕۆژ ئەمە دەڵێم کە بە هیچ شێوەیەك لەو تۆمارانەدا سـاختەو گزی نەکراوە ، بەڵام شتێك هەیە پێویستە بدرێتە بـەر سەرنج و لێکۆڵینـەوە :ـ تورکەکان بـە ئاسانی دەیان توانی لـە سەرژمێرەکاندا گزیی بکـەن ، ئـەویش بـە بڵاوکردنـەوەی پوختـەو ئـەنجـامێکی سـاختەی تۆمـارە ئەسلی یەکان ، پوختەی ئەنجامی سـەرژمێرەکان کە لـە ئـەسـتەموولدا بڵاوکرایەوە ، وێنەیەکی لێ دەرا بـە کۆنگرەی[١٢٩] ئاشتی و لـەگـەڵ سەرژمێرەکانی هەندێ ناوچەدا بەراوردم کرد ، وە لـە هەموو ڕوویەکەوە لەگەڵ یەکدی دەقاودەق دەر چوون ئامادەکردنی سەرژمێرێکی دانیشتوان لـە تورکیادا ، ئیشێکی گران نی یە ئەگەر بـە کارامەیی و ژیرانە ئـەنجام بدرێت ، چونکە سنووری پارێزگاو قەزاو ناحیەکان لـە لای هەموو کەس

وەك ڕۆژ ئاشكرایە ، وە ئەمەش كلیلێكی تەنگوچەڵەمەكەیەو ڕێگە بە كەس نادات كە لەلایەك ژمارەیەك هەڵگرێو بی كات بە پارسەنگی لایەكی دیكە .

بەهۆی پیاوە ماقوڵو سەرخێلەكانەوە ژمارەی دێهاتەكان بە ئاسانی دەزانرێ ، بەڵام ئەو ژمارەیەی كە دەستمان دەكەوێ هەتا ڕادەیەك زۆرترە لە ژمارەی تۆمارەكانی دەوڵەتی توركیا ، ئەو جیاوازییەش هۆی ئەوەیە كە لەپاڵ دێهاتەكاندا دێی وردەوردەڵە هەن كە لە تۆمارە ڕەسمییەكاندا بە یەك دێ دەچن ، بەڵام لە ڕاستیدا دوو دێی جیاوازن ، جاری وا هەیە خاوەن دێیەك ئەوەندە دەم ڕاستو دەسەڵاتە ، شوێنە وونی بە دێكەی دەكاو ڕێگە نادات بخرێتە ناو تۆمارەكانی دەولەتەوە ، ئەم ڕاستییە بەزەقی خۆی سەپاندووە كە تۆمارەكانی دەوڵەتی توركیا ، تەنها لە ٩٠٪ ی دانیشتوانی لە ژێر ئاڵایا جێگەی بووەتەوە ، لە (١٠٪) ەكەی تریش نەچۆتە ژێر ئەوسێیەرەوە . بۆ زانینی سەرجەمی ژمارەی هەموو دانیشتوان ، دەتوانین هەندێ بەڵگە ڕەچاوبكەینو پشتی پێ ببەستین :

١ - تێكڕای ژمارەیماڵەكان ، یاخۆ خێزانەكانی هەموو دێیەك .

٢ - تێكڕای ئەندامانی هەموو خێزانێك .

لە تاقی كردنەوەی وڵاتەكانی ڕۆژهەڵاتەوە ، ئەوەمان بۆ دەرئەكەوێت كە تێكڕای ئەندامانی هەموو خێزانێك لە (٥) كەس كەمترنین وەتێكڕای ژمارەی ماڵی هەموو چینەكۆمەڵایەتییەكان(١٣٠) ، لە نێوان ٢٥ تا ٨٠ ماڵدایە ، بەڵام ئەگەر چاوێك بخشێنین بە ناوچە بەربڵاوەكاندا وەك « پارێزگا » یان ئەنانەت « سنجق » یش ، بۆمان دەرئەكەوێت كە

جیاوازی زۆر کەمترە و لە نێوان ٥٥ تا ٧٥ماڵدایە ، لەم بارەیەوە ئەتوانن سوود لە پاشکۆی ژمارە (٣)ی ئەم ڕاپۆرتە ببینن کە ژمارەی خێزانە جۆر بەجۆرەکانی کۆمەڵە دێیەکی تیا شیتەڵ کراوە .

ئەو بڵاونامانەی « بیانات » کەلە چەند شوێنێکەوە گەیشتووەتە دەستمان ، ڕوونی دەکەنەوە کە تێکڕای ژمارەی ناوچەیەك بە وردی و ئاسانی دەزانرێت لە ڕێگای پرس کردنێکی زیرانە لە ناوچەیەکی گەورەتردا ، ئەوەی کە چنگمان ئەکەوێت لە ١٠٪ی کە مترنیە[١٣١] .

پاشکۆی ڕاپۆرتی عەسکەری کە لە لایەن وەزارەتی[١٣٢] جەنگەوە چاپ کراوە ، شارەزایەکی تێرو پڕمان ئەداتێ لە بارەی ڕێگەوبان و دۆخی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا لە ئاسیای بچووکدا ، لە سەر بناغەی ئەو ڕاستییانەی کە باسمان کردن ، دەرئەکەوێت کە ڕێژەی هەڵە کردن لە قەبڵاندنی ژمارەی دانیشتواندا بە هیچ جۆرێك کەمتر نیە لە ١٠٪ ی سەرجەمی دانیشتوان .

## [ دێی بولگاری کوردی لە قەزای مالاتیا ]

کوێخا پێی ڕاگەیاندین کە دێ کە (٦٥) ماڵە ، بەڵام تۆماری ڕەسمی ئەی سەپێنێ کە (٦٨) ماڵە ، هۆی ئەو جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ :ـ

أ ـ زۆر ئاسایەکە قەبڵاندنی کوێخا هەڵە بێت .

ب ـ بەهۆی جەنگەوە گەلێ خێزان ئاوارە یاخۆ لە ناو چووبن .

**خێزانی محمد گزیر :ـ**

(٨) خانەی تۆمارەکەیان ڕاستە بەڵام سەرۆکی ئەم خێزانە (١٣) ساڵ لەمەوبەر مردووە ، یاخۆ ٣ شووکردن و ژن هێنان لەم خێزانەدا ڕووی

داوە بەلام هیچ کام لەوانە ، لە تۆماری ڕەسمیدا پەنجەیان بۆ ڕانەکێشراوە •

خێزانی جعفر :ـ

(١٢) خانەی تۆمارەکەی ڕاستە بەلام ٣ زاووزێ و ٢ مردنو بیرخەرەوەیەکی بانگکردنی ٣ کەسی ئەم خێزانە بۆ خزمەتی سەربازی ئەوانە هەموو لە تۆماری ڕەسمیدا پەنجەیان بۆ نەبراوە • (Caya)

خالۆ :ـ

(٦) خانەی تۆمارەکەی ڕاستە ، بەلام منالێك کە ئێستا ٦ سالانە ، ژن هێنانێك کە لە سالی (١٩١٤) ە دا بووە ، «قورە» هاتەوەی یەکێکیان بۆ خزمەتی سەربازی ، ئەوشتانە هەموو ، لە تۆماردا پەخش نەکراون •

رسول محمد :ـ

٤ خانەی تۆمارەکەی ڕاستە ، کە بیانووی مال نەخراوەتە سەر تۆمار ، باسی ئەوە نەکراوە کە یەکێکی ئەم خێزانە ڕاپێچ کراوە بۆ سەربازیو براوەتە کۆڕی جەنگ •

گینەرل :ـ

٩ خانەی تۆمارەکەی ڕاستە بەلام منالێکی ١٠ سالانە هەتا ئێستەش نەدراوەتە قەلەم ، لە ٦ کەسی مردووی ئەم خێزانە تەنها پەنجە بۆ یەکێکیان درێژ کراوە •

حاجی کوڕی علی :

(٥) خانەی تۆمارەکەی ڕاستە لە ٣ مردن تەنها یەکێکیان چەز کراوە •

ئەبی خدری کوڕی وەهاب :ــ

٥ خانەی تۆمارەکەیان ڕاستە لە ٤ حاڵەتی مردن تەنها سێیان لە تۆماردا چز کراون ٠

## [ دێی کاشولی کوردی لە فەزای مالاتیا ]

عوسمانی کوێخا وەهای ڕاگەیاند کە دێکەیان (٢٠) ماڵە ، بەڵام تۆماری ڕەسمی دەڵێت ٢٥ ماڵە ، لەوانەیە هۆی ئەو (٥) ماڵ جیاوازی‌یە ئەمانە بێت :ــ

أ ــ ماڵێکیان وێران بووە ، ٢ ماڵیشیان تەنها دوو پیرەمێردی پەککەوتەیان تیایە ، لەبەر ئەوە نەدراونەتە قەڵەم ٠

ب ــ ٢ ماڵیشیان لە یاد چووە ، بەڵام ئەم گوفتو گۆیەی خوارەوە سەلماندی کە کوێخا ڕاست گۆبووە :ــ

١ ــ خێزانی یەکەم :ــ ٥ خانەی تۆمارەکەی ڕاستە منداڵێکی ١٠ ساڵان تۆمار نەکراوە ٠

٢ ــ خێزانی دووهەم :ــ ٧ خانەی تۆمارەکەی ڕاستە ٢ منداڵ بوون نەدراونەتە قەڵەم ٠

٣ ــ خێزانی سێهەم :ــ ٧ خانەی تۆماری ڕاستە ئەمیش دوو منداڵ بوون نەدراونەتە قەڵەم ٠

٤ ــ خێزانی چوارەم:ــ ٢٢ خانەی تۆماری ڕاستە، چوارمنداڵ بوون، ژن‌هێنانێک نەدراونەتەقەڵەم ، لە پێنج مردنیشدا هەریەکێکیان نوسراون ٠

# [ دێی یوکار بنیزی ]

دێیەکی تورک نشینە و ۳۲۰ ماڵێك دەبێت ، کوێخا پێی ڕاگەیاندین کە دێ کەیان (۳۰۰) ماڵێکە ، بەڵام لە تۆماری ڕەسمیدا (۳۲۰) ماڵە ، بەلای کوێخاوە هۆی ئەم جیاوازی یە ئەوەیە ، کە هەندێ خێزان لە کاتی جەنگدا ئاوارە بوون ، بەهەر حاڵ کوێخا ناتوانێ بە ووردی ژمارەی ماڵەکان دیاری بکات ، لەوانەیە ئەو ماڵانەی کە تۆماری ڕەسمی بە ماڵێکی سەربەخۆی دابنێ قەڵەم لەلای کوێخا هەریەك ماڵ‌و جیانەبوونەتەوە

**خێزانی ماشی ئەولا عوسمان :ـ**

۱۲ خانەی تۆماری ڕاستە ، دوو منداڵیان نەخراونەتە تۆمارەوە •

**خێزانی کالاس ـ حاجی حسین :ـ**

تۆماری ئەسڵی‌و گۆڕانی لەمەودوایان ڕاستە •

**خێزانی ئال جولی قیلی :**

مردنێك لەم خێزانە نەدراوەتە قەڵەم •

**خێزانی دایو مایخو ئۆلۆ حاجی حسین :ـ**

تۆمارەکەی هەموو ڕاستە •

**خێزانی بوجیك ئۆلۆ احمد :ـ**

تۆمارەکەی ڕاستەو گۆڕانەکانی دوایشی هەموویان ڕاستن جگە لەژن هێنانێك نەبێت کە تۆمار نەکراوە

**خێزانی ئاق قالی ئۆلۆ قیلی :ـ**

خانەکانی ڕاستە لە ۷ مردن سیانیان چز کراون ، منداڵ بوونێك

بەنجەی بۆ ڕانەکێشراوە •

شتێکی سەیرە کە جیاوازی‌یەکی زەق لە نێوان دێهاتی کوردو تورکا بەدی دەکرێت ، بە تایبەتی لە بارەی هەڵەو ڕۆخلەی سەرژمێرەکان ، لە ناو کوردەکاندا زۆرترەو لە لای تورکەکان کەمترە • بە بڕوای من هۆی ئەمە دەگەرێتەوە بۆ ئەو ڕاستی‌یە کە تورکەکان لە کوردەکان مل کەچ‌و گوێ ڕایەڵ‌ترن بۆ حکومەتەکەی خۆیان •

## پاشکۆی ژمارە ( ٢ ) خشتەکە

## لە دوو لاپەرەدایەو بە جیا

## نووسراوە

# [ ڕۆژ ژمێری کوردی ]

وەك بۆمان دەر ئەکەوێت کە :ـ ڕۆژ ژمێری ساڵانەی کوردی لە سەر شێوەی کۆن دیاری کراوە ، ١٣ ڕۆژێك لە ڕۆژ ژمێری ڕۆژ ئاوایی لە دواترە(١٣٢) ، بۆ نموونە ڕۆژی ٢٠ی شوبات ڕێکەوتی ١٣ای مانگی گایجوٹی کوردەکان دەکات •

ئەم خشتەیەی خوارەوە ناوی مانگەکانە بە تورکیو کوردیو عەرەبی ٠

| ز | عەرەبی | تورکی | کوردی |
|---|---|---|---|
| ١ ـ | کانون ثانی | کانون سانی | کانونا پاشی |
| ٢ ـ | شباط | شوبات | گایجوك |
| ٣ ـ | آذار | مارت | ئادار |
| ٤ ـ | نیسان | نیسان | نیسان |
| ٥ ـ | مایس | مایس | گوڵان |
| ٦ ـ | حزیران | حازیران | هێزیران |
| ٧ ـ | تموز | تاموز | تیرما |
| ٨ ـ | آب | أوستوس | تەباخ[١٣٤] |
| ٩ ـ | أیلول | أیلول | ئایلون ، ئایلول |
| ١٠ـ | تشرین اول | تاشرین ئاوال | چریا بەری |
| ١١ـ | تشرین ثانی | تاشرین سانی | چریا پاشی |
| ١٢ـ | کانون اول | کانون ئاوال | کانونا بەری |

بەهار لە ١/مارتدا واتا لە (١٣ی ئازار) دا بە پێی شێوەی تازە دەست پێ دەکات ، هاوین لە ١/حزیراندا واتە لە ١٣ حزیراندا دەست پێ دەکات ، وە هاوین هەتا کۆتایی ئاب دەخایەنێت ، پایزیش لە ١/ی ئەیلول واتا لە ١٣ ئەیلولەوە ، بە پێی رۆژ ژمێری رۆژ ئاوایی دەست پێ دەکات زستانیش لە ١/ی کانونی بەری ، واتە ١٣ کانونی یەکەم دەست پێ ئەکا « چلە » یش کە (٤٠) رۆژی ساردی زستانە ، لە ١٠ی کانونی بەرییەوە دەست پێ دەکات ، کە رێکەوتی ٢٣ ی کانونی یەکەمەو

دەخایەنێ هەتا ۲۰ ی کانونی پاشی واتە هەتا ۳/شوباتی ڕۆژ ئاوایی •

دوای چلەیش ماوەیەکی تر دێت ، کە ۲۰ ڕۆژەو لـە ۲۰ ی کانونی پاشی‌یەوە دەست پێدەکات ، وە هەتا ۱۱ ی ئایجوك واتە لـە ۳ هەتا ۲٤ ی مانگی شوبات ، دوای ئەمە ماوەیەکی تر دێتـەکایـە کـە ٤۰ ڕۆژی تـر دەخایەنێو بـە چەقی بەهار ناسراوە • ئەم چلەیە لە ۱۱/ئایجوکەوە هەتـا ۲۱ مارت دەخایەنێت ، واتـا لـە ۲٤ شوبـا تـەوە هەتـا ۳ ێی نیسان •

بە هۆی ئەم چەند دێڕانـەی خوارەوە دەتوانین چـوار وەرزەکـەو بەشەکانی دیکەی لەبەرکەین :ـ

۱ ـ چل چلەیە ، بیست پاشەیە ، چلی تریشی هەیە ، دوای ئەمانـە جریوەی چۆلەکەی بەهار جیهان پڕ ئەکات •

۲ ـ وەکی ماها ئایجوکێ کەف دەکەنێت کەف دەگیرێت وەکو مانگی شوبات دەمێ ئەکەنێ و دەمێك ئەگری •

۳ ـ خوشکا ئازار :

بدێ من ڕۆژێکی سار

جارئەزگیسکی پای بیکەمە دار

خوشکە ئازار ، ڕۆژێکی ساردم بەرێ ، هەتا بتوانم بەچکە ئاسکێکی تیـا ڕاو بکەم •

لەو دێڕانەی سەرەوەدا ، یاری بـە ووشە کراوە ، ئەوەتا :ـ گیسك بـە چکە ئاسکیش ئەگەیەنێو دەری ئەخات کە یـەکەم ڕۆژی ئـازاریش ڕۆژێکی ساردەو زۆر جار دەبێتە هۆی کوشتنی بێچووی ئاسکان ، ئەوچەند دێڕەی سەرەوە بە زمانی شـوباتەوە ووتراوە کـە ۲۸ ڕۆژەو لـە ئـازار داوا دەکات کە لـە ۳۱ ڕۆژەکەی خۆی ڕۆژێکی بداتێ •

٤ ـ هیندێ ئازار ژ ماهان یت زوزان لاپیری حەرام بت •

لە مانگی ئازارا کوێستانەکان لە پیرەژنان قەدەغەن ، چەند چیرۆکێك بووەتە بنەمای ئەو باوەڕە :ـ

جارێك کەشێك هاتو دڕندانی ئاسمان پیرەژنێکی لەخشتە بـرد ، پیرەژنەکە ئاژەڵەکەی دەرکرد بۆ لەوەڕخۆری ، بـەڵام کە زۆر بـەرەو ژوور دەبێتەوە ئاسمان ناوچاو ئەدا بەیەکا و هەوای لێ دەگۆڕێت و ئاژەڵە کەیشی قڕ دەکات •

٥ ـ هە شدە ئازاری ئاف غو گوبکە داری لە هەشتی ئازارا لافاو بەر ئەبێتەوە بەڕادەیەك پۆپەی دارەکانیش دا ئەپۆشێت •

٦ ـ نیسان دۆ دێ کیسان بەر دەری هـەمی پیسـان لـە نیساندا دۆ ئەوەندە زۆر دەبێت ئەنانەت هەموو ماڵێکی هەزاریش دەی ڕێژێ •

٧ ـ بیستو چاری نیسان گامێش چونا گەڕانی هاتنەوە گونی دانی •

بیستو چواری نیسان سەرەتای کەشێکی خۆشە بەڕادەیەك گامێش شوێنی زستانی جێ ئەهێڵێو ئەڕوا بۆ لەوەڕی بەهـار خـواردن ، بـەڵام ئەوەندە تەپۆنو لـەنواریان ناشـرینە هـەرمل لـەنێنەوە بۆ « گـونی » و پەسمەنەکەی زسـتانیان •

٨ ـ لـە دەشتێ[١٣٥] نیسان ناچێت بای گوڵ دا گوڵان ناچێت بـای مـل •

نیسان ناڕوات هەتا سەر لـە هەموو گوڵێك نەدات مایس یش ناڕوات هەتـا نەی وەرێنێو نەی کات بە چەپك •

٩ ـ گوڵان کاڵا کاڵا میانـا •

لـه مایس‌دا مەڕ بەهۆی گەرماوە ئەکەوێتە هەناسە بڕکێ •

١٠- هەزیزان خەنزیری گیا لـە بەیاران خوزیری • کە حوزیران وەك بەراز جوولا گیای لاپاڵە ڕووتەنە کانیش دەخێزێو تاو ئەسێنێ •

١١- تیرما سەری کەچەلان دەسوزهیت • لە مانگی تیرمادا سـەری کەچەڵ دەسووتێ •

١٢- تەباخی میە دەگرن کیماخی
لـە مانگی ئاب‌دا ئـاژەڵ تێر دەخوات •

١٣- لـە ناوە کوردەکانا ١٥ ی ئەیلول نـاوی [ کـەو شیرین ] •، لەو شەوەدا لە ژێر تریفەی مانگە شەودا پـۆڵ پـۆڵ کەو ڕەو دەکـەن • پێویستە ئەو شەوە مانگە شەوی چواردە بێت‌و ئەوەندە ڕووناك بێت ، پۆلە کـەوی لاپاڵو نزارەکان وابزانن ڕۆژەو بکشێن بۆ چینەو چنگە پۆڕە •

١٤- شەمی شەماڵ دینی •
شەڤی ی شیرین دریژا
چیرۆکیکی ژ مارە بێژە

شـەوەکـانی [ ئۆکتۆبـرو نۆڤمبر ] زۆر درێژن • دەتـۆیش ئـەی حیکایەت خوان بێ فەزابیت چیرۆکیکی خۆشـمان بـۆ بگێـڕەوە [ ئـەی ئـەوکەسـەی گۆچانەکەی دەستت بووە بـە تەختی مۆم ] •

# [ شەخسیەتی کوردی لە دەلافـەی پەندی ]

# پێشینانەوە

• ئەم پەندانە بەزاراوەی هەکاری نوسراون •

ئەم باسەش خۆی لەخۆیا قەبەو پەلو پۆدارەو ناو زۆر دەبات ، هەڵە گرێت گەلێ شتی لەسەر بنوسرێت ، هەندێ جاریش ئەو پەندانە بۆنی ئەوەیان لێ دێت ، کە لەواتادا دژ بە یەك بن و هەندێ جاریش سەرە ڕۆیی و • بێ لێ هەڵبڕین بە رەقی لەواندا ڕەنگی داوەتەوە ، ڕاستیش هەرچۆنێك بووە ، وون نابێت و ئەدۆزرێتەوە ئەگەر لە سەر تاڵە دەزوویەکی زۆر باریکیش بووە • ئەم گوڵبژێرانەی خوارەوە بەو نیازە هەڵم بژاردوون شەخسیەتی مرۆڤی کورد بخەمە بەرچاو ، هیوام وایە لەوەش ببورن کە بەم پەندانە هەموو ڕووەکانی ژیانم تێر نەکردووە ، چونکە وێژەی(١٣٦) کوردی لاوازەو زۆری لە هجەکانی کوردیش سەرباری هەموو ، بوونەتە هۆی ئەوەی کەبێکانەکان تووشی دامان و پەی نەبردن بن لە هەموو ڕوویەکی کۆمەڵێ کوردەواری‌دا • کورد نەتەوەیەکی شاخاوی و کێونشینەو هەموو شێوازەکانی دانیشتوانی شاخ ئەوانا هەیە [illegible] :ـ

شەیدای ئازادی‌ن شانازیی‌و بەخ ئەکەن بەشکۆو بەرزی نەتەوایەتی(١٣٧) یانەوە ••• ئەم سیفاتە خێڵەکی‌یانە گەلێ جار کوردی خستۆتە نێو فەرتەنەی وەهاوە کە بە ناچاری پەنابباتە بەر چەك ، تەنانەت زۆر جاریش بە بیانوێ هیچ و پووچ دەستی داوەتە چەك ، لە ئەنجامیشدا کەوتۆتە چەقی فیتنەو دوژمنایەتی‌یەکی خوێناوی‌و درێژخایەنەوە •

١ ـ مرۆڤ خوێندار بێت قەدار نەبێت •

مرۆڤ دەستوپلی خوێناوی بێت باشترە لە وەی قەرزاری خەڵك بێت •

٢ ـ جانا مرۆف دەکیویت نافا مرۆف نا دەرکەویت گیانی مرۆف ئەمرێ وەلێ ناوی نامرێت ، یاخۆ بە واتا « کەم بژی‌و کەڵ بژی یەکەی لای خۆمانە ـ وەرگێڕەکان •

٣ ـ وەکی دی مرۆف ڕەزیل بت بلا مالی مرۆف ڕەزیل بت •
ماڵت بڕوا زۆر باشترە لە ئابڕوو چوون •

بە گشتی هەستی دوژمنایەتی و ناکۆکی لەسەر شتی پڕو پووچ لە ناو کوردەکانا هەیە ، بە سروشت کەللە ڕەقن‌و ئاشتەوایی ناکەن ، کوردەکان مرۆڤی سەرسەختن‌و بەخێرایی تووڕە دەبن‌و قسە ئەگرنە دڵ [ بەڵام بەخێرای‌یش دڵیان پاك ئەبێتەوە و هیچ لە دڵیانا نامێنێ ـ وەرگێڕەکان ـ •

٤ ـ دوژمنا بابێ نابتە دوستا کوڕێ •
دوژمنی باوك نابێت بە دۆستی کوڕ(١٣٨) •

٥ ـ ڕێ دەبنە بەهوست دوژمنی نابنە دۆست • پیر ئەبێت بەڵام دوژمنت هەرگیز نابێ بە دۆست •

٦ ـ شەو ڕا دەزین دوژمن نا ڕازین • خەڵك بەشەو ئەخەون بەڵام دوژمندار هەرگیزاو هەرگیز چاو لێك نانێن •

٧ ـ ئەگەر دۆست هەزار با کەمە ئەگەر دوژمن یەك با زۆرە •
دۆست(١٣٩) هەزاری کەمەو دوژمن‌یش یەکێکی زۆرە •

٨ ـ تولا خدا نە سەر دوژمەنا خدا نەهێڵە لە بەینی خۆت‌و دوژمنەکەتا هیچ حسابێك مەهێڵە • [طبعا لە کاتێکا مەچەکت چەخا ـ اقتدار] ـ وەرگێڕەکان ـ •

٩ ـ خالون خوارزا ڕاکرن مامه برازا چاڵ کرن • خاڵوان خوشکەزاکانیان ئەبەنە لای خۆیان بەڵام مامەکان برازاکانیان ئەخەنە چاڵ •

ئەم پەندانە ئەو ڕاستی‌یە ئەخەنە ڕوو کە ناکۆکی و دوژمنایەتی لە نێوان براو برازایشدا سەری هەڵداوە ، لە هەمان کاتیشدا لە خوێن خۆشکردن‌و ئاشتەوایی ـ تصالح ـ دا کچێك ئەدرا لەخوێنا •

١٠ـ تە ئە نادیم چاوێکا من تە ناوی هەردوو چاوان •

ئەگەر بە چاوێکت حەز لە چارەم ناکەیت منیش بە هەردوو چاوم ئەتبوغزێنم •

کورد جوانترین قسەی کردووە لە بارەی دوژمنەوە :ـ

١١ـ دوژمنا دانا چیر ژ دوست نا دانا دوژمنی ژیر باشترە لە دۆستی نەفام •

لە دێر زەمانەوە کورد بە شەڕو جەنگاوەریی ناوبانگی دەرکردووە، دیارە شتێکی ئاسایی‌یە کە ئازایی‌و لە خۆبوردن بە نرخترین شتە لە لای ئەوان :ـ

١٢ـ میرین بریسا ژ پورینی •
ئازادي سەر بە زۆرترین کەس شۆڕ ئەکا •
١٣ـ مەردی بێ زۆڵا

ئازادی هەرگیز زۆڵی لێ ناکەوێتەوە • یاخو ئازایی ، ئیشی خوێڕی‌و بێ بایەخی لێ ناکەوێتەوە •

١٤ـ چەکا میران نیڤا کارا
چەك تەنها نیوەی نەبەردە •

لـه خۆ بوردن ئەساسەو هیچی کەمترنیە لـە چەك •

۱۵ـ خودی بـە مرۆڤ یاربت شیرا مرۆڤ بلا داربت

ئەگەر خوات لـە پشت بێت ، باشمشێری دەستیشت دار بێت •

ئازایی و خێڵە کێنی ئەم کۆمەڵگایە ، هەرگیز ناگونجێت لەگەڵ ژیانی ئاسوودەگی و مرۆڤـایەتیدا •

۱٦ـ بەرخی نێر ژ کێردێ رایە

بەرخی نێر بۆ سەربڕینەو مێیش بۆ داشت •

۱۷ـ مردن میوانا هەمی کەسیا

مردن میوانی هەموو ماڵێکە •

۱۸ـ مردن هەبێ کاڵ بوون نەبێ

مردن بێ‌و پیری نەبێت •

۱۹ـ مرن مرنـا قرەقر چی‌یـا •

مردن مردنە ئەم هەرایە چی‌یە •

گەڕیدە بێگانەکان تاوانی خرابی کوردەکان ئەدەنە پاڵ سـروشـتی کوردەکان ، لە کتێبی « ڕابەری کـەڕیدەکان لـە وڵاتی مابین النهرین » دا بـەشـی یەکەم هاتووە :ـ

لـە دێـر زەمـانـەوە ژیـانی مرۆڤـایـەتـی کـوردەکـان بـە دڵ ڕەقـی‌و چەڵـەنگی‌و ئـازایـەتـی‌و لـووت بـەرزی نـاوبـانـگی دەر کردووە ، لـەوانەیە هەندێك جار مامەڵەو هەڵس‌و کەوتیان بگاتە ئەوبەڕی جانەوەری ، لەبەر ئەوەی بەسووکی تەماشای یاساکانی جـەنگ دەکەن‌و لـەو ئاقارەدا جاڕیان پاك نیە(۱٤٠) ، بـەڵام منیش لـەم باردیـەوە ئـەبمە پـاربزەرو دەڵێم :ـ ئەو شتانەی ئەدرێتە پاڵ کـوردەکان ، لـە ڕاستی دا

ئەنجامێکی ئاسایی ئەو زیانە سەختو نالەبارەیە کە تووشی هاتوون ، لەو لایشەوە ناکۆکی و دوژمنایەتی عەشایەری ، بوونەتە خۆرەو دەمیان زندۆتە ئەم نەتەوەیە ، ئەو ڕاستی‌یەش لەیاد نەکەین کە نیشتمانەکەیان بۆ ماوەی چەند سەدەیەکە لە زێر باری چەوسانەوەو کزیو هەژاری‌دا دەناڵێنێ ، لە لایەن جۆرەها بێگانەوە ولاتەکەیانی پێشێلو تالان کراوە ، ئەو بێگانانە تۆسقاڵێك ڕەحمو سۆزی مرۆڤایەتیان بەرامبەر ئەم ڕەگەزەی زێر دەستیان پیشان نەداوە ، مرۆڤی کوردیش لە ئەنجامی ئەو شتانەی باسمان کردن بووەتە مرۆڤێکی ئالۆزو مەنگ ، کەوتۆتە گێژاوی بیرکردنەوە لەوشیری ڕەحمو سۆزی مرۆڤایەتیە ، کە هەتا ئێستایش دلۆپێک نەکراوەتە دەمی‌و هیچ ئاشنایەتی‌یەکی نەبووە لەگەڵ ئەو شیرەدا!!

کوردەکان بە توندی لەگەڵ ئەوەدان کە حەلوا بەری توندو تیژی‌یە .

٢٠- ڕاکە بنانا خوە بەردە جانا خوە
کەم بخۆو کەڵ بژی .

٢١- دکوشی ونێ ریهان وا رو
ڕۆنی ڕزاوی خۆت بخۆ .

٢٢- بیانی بدی کوشتێ جانی ئاقیبەت پەشیمان ئەگەر زیانت بیەخشیت بە بێگانە لە ئەنجام‌دا هەر پەشیمان دەبیتەوە .

٢٣- سێ‌ما لەبەر دەری‌ما ناپەڤیت لەدەر خالوی دەرڤیت .

سەگی دەرماڵ هەر پاسی خاوەن ماڵ ناکا بە تەنها بەڵکو دوور ئەکەویتەوە و پاسی هاو ماڵیش دەکات .

٢٤- ز ئاڤا مەند بترسە ز ئاڤا گوڕ مەترسە . لەئاوی مەنگ بترسەو لە ئاوی خوڕ مەترسە . کوردەکان بە ئالۆزی‌و گاڵتە پێکردنەوە تەماشای

ژیان دەکەن ، جا لەو دەلاقەیەوە ئەگەر بڕوانینە باری سەرنجیان ، دەرئەکەوێت کە مرۆڤی کورد چەند بە ژیرانەو واقعی‌یانە ، تەماشای مەسەلە جۆر بەجۆرەکانی ژیان دەکات ، بە تایبەتی ئەو مەسەلانەی کە بە دڵ ڕەقی‌و توندو تیژی سواخ دراون •

**٢٥ــ سلاو لەڕیهان نینە سلاو لە میهانە •**

سلاو لە ڕیش سپی ناکرێت ، سلاو لەو کەسە ئەکرێت کەڕان و ئاژەڵی هەیە ، [ یاخۆ زەمانی کەوا بخۆیە ــ وەرگێڕ •

**٢٦ــ هەر پێغەمبەرێکی دوا لە جانا خوە گیرریا •**

**هەموو پێغەمبەرێك خەمی گیانی خۆیەتی •**

**٢٧ــ وەکی هورچ پیر دەبت کوتێلە پێدەکەنین •**

**وورچ کە پیر بوو ئەبێتە گاڵتە چی ڕێوی •**

**٢٨ــ سینگ نەچێت مێهکوت دەبت •**

مێخ کە دانەچێت کوتانێکی نەوێت •

**٢٩ــ حەقی بزنا کول ژ بو شاخ نامینیت •**

بزنی شاخ دار دان بە مافی بزنی کۆڵدا نابێت •

**٣٠ــ تۆ عەلی شاعیر با سەر سەرا کێڤربە •**

**کێڤر ژ تەرا تالان ، ژ مەرا •**

هۆ عەلی شاعیر لەسەر بەردەکە هەڵتروشکێ ، •• با بەردەکە بۆ تۆ بێت‌و تالان‌و چەپاویش بۆ من • [ مەبەست لە عەلی شاعیر ئەوکەسەیە کە لە لایەن جەردەکانەوە تالان کراوەو هیچی بۆ نەماوەتەوە ، کردوویەتە سەرگا بەردێك و لە جەردەکان دەپارێتەوە ، هەندێ لە شتەکانی تالان نەکەن ، ئەوانیش بەو شێوەی سەرەوە وەلامی ئەدەنەوە !!

**٣١ــ هەرچی کەریك هەیە کوڕیك هەیە •**

هەر کەسێك یەکێك شك بات قەرزی لێ بکات وابزانێت کوڕێکی هەیە •

لەبەر ئەوەی مرۆڤی کورد بە درێژی چەند سەدەیەکە ، تووشی ستەمو ململانی بێ ئەمان هاتووە لە دژی بەندایەتیو زۆر دارانی داگیرکەر ، ئەوەش بووەتە هۆی ئەمە کە شەخسیەتی کوردی سەربەخۆییو نەفس بەرزی لێ دەبارێت •

٣٢ـ مالێ خواستی ناگانە هەستی •

مالێ خوازراو هەرگیز تا سەر خێر ناداتەوە •

٣٣ـ تۆ دەرێ کەسێ نەکوتی کەس دەری تە ناکوتێ •

یەکێك مالێ لە شووشە بێت بەرد ناگرێتە مالێ خەڵك •

٣٤ـ نانێ هۆرکە منەتا خەلقێ پافێ •

نانو ئاو بخۆیت باشترە لەوەی کەلە هەڵسوکەوتا ئازاد نەبیت •

٣٥ـ مرۆف دیکێ ڕۆژەکێ بت بلا مریشکا سالەکی نەبت •

کاژێرێك « سعاتێك » ئیش کردنی بە شەرەفانە زۆر باشترە لە سەدەیەك ژیانی بێ ئابڕوویو بەد ناوی •

دەقی ماناکەی :ـ ڕۆژێك کەڵەشێرییی باشترە لە سەدەیەك مریشکی •

تاقی کردنەوەی دوورو درێژی مرۆڤی کورد وەك ڕەگەزێکی ژێر چەپۆکی دەوڵەتی تورکیا ، گەیشتۆتە ئەو ڕاستییە کە خۆی بەدەنگێکی دەهۆڵی دووری ڕزیو نەلاوێنێ ، بەلکو ئەوشتانە ڕەچاودەکات کە دیارەو لە بەردەستایە •

٣٦ـ مالێ نەخواری یە زاڵمایە

ماڵی خۆنە خۆر بۆ چەکمە بۆر •

٣٧ـ مالی ئەوی شاندی خەلقی گـەرمەشاندی •
ماڵێك دەمت تێی نەچێت خەڵکی تر لە دوای تۆ تەراتێنی بە سەرەوە دەکەن

رەفتاری ئاسایی هەموو مرۆڤە شاخ نشینەکان دەچنە سـەر یەکدی ، هەموویان گوساخ و ، سەختی ، دڵو دەروون فراوانن ، میـوان پەرستو قەدرزانن ، ئازاو چەلەنگن ، لە پەندەکانی ٣٧ و ٣٨ دا ئەو هەستە توندو بـە سۆزە بەزەقیی خۆی دەنوێنێت •

٣٨ـ جامێر دەچن ئاڤان دەهێلن کوێر دەچن باران دەهێلن •
جەنگاوەرە ئازاکان دەمرنو شۆرەتی شـەرەفو نـەمری بـەجێ دەهێڵن ، ڕژدو باخەڵ قووڵەکانیش تەنها ماڵ جێ دەهێڵن •

٣٩ـ مالێ کوبری ناچێتە گۆری •

سامانی مرۆڤی ڕژدو پارەپیس لەگەڵ خۆیدا ناچێتە گۆڕ •
هەستو گیانی نیشتمانی (١٤١) بە مانایەکی پڕ بە پێی ڕۆژهەلاتی یـانەی ئەم ووشەیە ، ڕیشەیەکی لاوازو بێ گیانی هەیە لەم وولاتەدا، بەلام هەستی نەتەوایەتی لـە ناو ئەو جەماوەرە زۆر و بەربلاوەدا لـە چـوار چێـوەی پەیوەندیو خۆشەویستییەکی خێلەکی لادێیانەی تەسکدا خۆی دەنوێنێ، ئەو هەموو شاخو لاپانە سەوزەی کە بووەتە لەوەرگای تێرو تەسەلی ئاژەڵو ماڵات ، ئەو هەموو کانیو ئاوە ساردو چوڕی شیرە کە لـە دەربەندەکانەوە شۆر دەبنەوەو هەوارگەی هاوینو زستان دەگەینەوە بە یەکـدی ، ئـەو هەموو دەشتە بـە پیتو فەڕەی کە لە هەموولایەکەوە سنگو بەرۆکیـان والا کردۆتەوە ، ئەمانە هەموو چەند هۆیەکی بەتینو کاریگەرن بۆ ئەوەی باشتر جنگ لەخاکەکەیان گیر بکەنو شەیدای بین هەتا باشتر لە کوردەکان بگەینو زۆر تر لێیان نزیك بینەوە ، خێراتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کـە

ئەو هەموو سۆزو خۆشەویستیە ، لـە هەستێکی قوولـێ نەتەوایەتی یـەوە هـەڵقوڵاون .

٤٠ـ بلبل دانان قەفەسا زێڕ کرە گازی ئاخ وڵات ئاخ وڵات .
بولبول هەرچەند لە قەفەزی زێڕا بێت ، هەر ئەڵهای نیشتمانەکەیەتی .
شـام شەکرە وڵات شیرینترە
بـەڵێ شـام جوانو قەشەنگە بەڵام نیشتمان جوانترە .

٤٢ـ وڵاتـا من نینـا نیزاما قانونـا وڵاتـا زووریناڤەم وڵاتە هی مـن نی یە [ واتـا من لـە وڵاتی خۆم ئاوارە کراوم ] ئەو یاساو نیزامـەی لـەم وڵاتـەدا هەیە هی دەشتەکی یەکانە ، بەڵام ئێمە هەر بەو هەوایە دەژین کە لەلای شوێنە بەرزەکانەوە هەڵئەکات .

لـەو چەند دێڕەی سەرەوەدا هەستو سۆزێکی پتەوی خێڵەکی یانەی تەمك بینی سـەر ەەڵئەداو هەناسەئەدا ، لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا ئەو هەستە باشتر ڕەنگ ئەداتەوە :ـ

٤٣ـ بدێ گوشتێ جانێ ئاقیبەت پەشیمانی .
هەزار سـاڵ بکەی بێگانە پەرستی لە ئەنجامدا دەهێنی نوشستێ .
٤٤ـ خوەیانی مرۆڤ بکوژن هێسکی مرۆڤ ڤـە پەشێرەن .
خزم بیشت کوزێ ناهێلێت بۆگەن بکەیت .
ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ، بێگانە بـام فرێ بدرێتو بۆگەن بکات .

مرۆڤی کورد خاوێنو پوختە ، بێ ڕەوشتیو بـەرەڵایی ی لـەنـاو ئەماندا دەنگو ڕەنگیان نیە ، بەنگ کێشان کە زۆر باوە لەناو فارسەکاندا، خواردنەوەی مەی نە ناو تورکانا ڕاکی یا خـۆ ڕاقـی پێ دەڵێنو زۆریش بـەنرخە ، بەڵام ئەمانە لـە ناو کوردەکانا زۆر قەدەغەیەو قێزەونە ، خـۆ

ئەوسنی و چڵێسی سەر خوانو سفرە هەرباسی ناکرێت چەند ئەنگەو مانەی ئابڕوو چوونە ، بگرە لە هەموو لایەکەوە گاڵتەی پێ دەکەن و بەسووکی تەماشای دەکرێت ، بۆیەکا کوردەکان زۆربەیان تەنکە پیاوو شووشەیین ، بەڵام بەهێزو شانو باهوون •

٤٥ـ هەمی تشت ژ زراڤێ دبردت ئینسان ژ ستویری •

هەموو شتێك بەهۆی تەنکیو کەم رایجیوە دەشکێت ، بەڵام مرۆڤ لە ئەستووریدا دەشکێت •

٤٦ـ کەم بخوە هەر کەف بخوە

کەم خۆری دایم خۆر بە •

٤٧ـ لوقمەکا نانێ بەدڵ سفرەکا زادێ نا بەدڵ •

پارووێەك نان بە ئیشتیها ، زۆر خۆشترە لە خانێکی هەمە جۆر •

٤٨ـ خەو و خەمو خواردنێ هەرسێ دوژمنێ غەدارن لاچۆ کەس نەبەرن •

خەوو خواردن و خەم = دوژمنێکی سەرسەختی مرۆڤن •

**ژنهێنان :ـ**

ژن هێنان بە لای کوردەکانەوە زۆر پیرۆزە لە گەلێك لە موسڵمانەکانی دیکەی عەجەم و تورکان بە بایەخ تر تەماشای ئەو پەیوەندییە دەکەن ، ئافرەت لە کوردستانا ، لە چاو ئافرەتە موسڵمانەکانی تر ا ئازاد ترن ، زۆربەی ژنهێنان و شووکردن لە ناو کوردەکانا ، لە ئەنجامی دڵو دڵخوازییەوە سەر هەڵئەدات ، ئەو یەککەوتنەی لەو ئەنجامەوە پەیدا دەبێت دەورێکی باڵاو سەرەکی دەگێرێت لە خێزانی تازەدا •

٤٩ـ ژن ستوونا مالێیە

ئافرەت کۆڵەکەی ماڵە

٥٠- ژن بێنە بـە لادی دا کوڕ بتەرا بگەهن •

بەگەنجی ژن بهێنە تـا لەگەڵ منالەکانتا بـە خۆشی بژیت نـەوەك بـە پیری •

٥١- ژن و مێر تەفر و بێر

تەنها پاچ پێمەڕە ژنو مێرد لەیەك دەکات •

٥٢- مێریێ من لاو بە کراسێ من جاو بە کراسم جاو بێت ، مێـردم گەنجو ئازابێت ، ئەم ووتەیە بە زمانی ئەوکچۆڵەیـەوە دەوتـرێت کـە چاوەڕوانی شووکردن بێت •

٥٣- مالا زاڕۆك تێدە شەیتان نایتە ئیرە • مالێ پڕ منال شەیتان ڕووی تـێ نـاکات •

٥٤- زاڕۆك فێکێهیت مالانن

منال میوەی مالـە

ئەوەی بەگشت جێگەی سەرنج گیانو هەستی ئەو پەندانە بە گشتی لایەنی یەکژنە پەسەند دەکەن • ئەم پەندانـەی خـوارەوە هەندێك لـەو مەسەلانە دەنوێنێ •

٥٥- مێری دوو ژن دەرگەڤانە

پیاوی دووژنە دەرگاوانە

بە واتا ناکەوێتە ماڵ •

ئەم بەڵـگە نامانەی خوارەوە ڕوویەکی زۆر ئـابدیـاتیو خاوێنی ژن هێنان دەخەنە ڕوو . لـە بەرئەوەی کورد بەوە ناسراوە کـە زۆر واقعـین بۆیە گرنگی بە لایەنی زەقو کاریی ژن هێنان ئەدەن وباس دەکەن :-

٥٦- مێر چەمە ژن گومە

پیاو جۆگەیەو ئافرەتیش گۆمە •

٥٧ـ لەژنا نەکەڕە لـە خزما بگەڕە مەگەڕێ بە شوێن ژنی جوانا ، بگەڕێ بە شوێن خزم و عەشرەتا •

**ئـافـرت :ـ**

ئافرەتی کورد بـە داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزی ناسراون ، « تەنهـا سزای » زیناو داوێن پیسی لەلای هەموو خێڵە کوردەکان کوشتنە •

٥٨ـ ژنـا شەرمێ بشەهرەکی مێرێ شەرمێ بـ کارەکی •

ئافرەتی بەشەرم و داوێن پاك شارێك دەهێنێت مێردی شەرمن و قەپۆلە گیسکێ ناهێنیت •

٥٩ـ ژن قەلایە مێر فەلایە

ئافرەت قەلایەکە پیاو گەمارۆی داوە •

٦٠ـ ئەقلێ ژنان دکۆشێ دانە وەکی ڕادبت « بلاف دبت » •

ئافرەتێك لەماڵەوە دانیشێت هۆش و هەستی لـە سەر خۆیە ، بـەلام ئافرەتی ماڵان گەرو هەرزە ، لـە لای خەڵکیش سووك و ترۆزـەو لــە ئەقڵیشـا تەواو نیـە •

٦١ـ هند ژنن هند ژانن هند مەلهەمێ دلانن هند خانما لیرو رانیم •

هەندێ ژن ژانەو هەندێکیش مەلحەمی دلانەو هەندێکیشیان ورگ دەئاسنو بـەس •

**پەیوەندی نێوان نێرو مێ :ـ**

ووشەی [ سۆزانی خانە ] brothel بە هیچ جۆرێك لـە نـاو کوردا نی‌یە ، کورد کە باسی یەکێکی لـەش ساخ و « شانو بـەهوودار »

بکات دەڵێ ڕەبەنە ، لە زمانی کوردیدا ، ووشەی شەرواڵ پیس نیە ، لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوچەکانی کوردستانا ووشە فارسیەکەی ، لەناوچەکانی باکووریشدا ووشە روسیەکەی ، لە بەشەکانی باشووریشدا ووشە عەرەبیەکەی ، لە بەشی ڕۆژئاوایشدا ووشە تورکیەکەی بەکار دەهێنرێت •

کوردەکان بە ژیانی ئاژەڵداریو خێڵەکیەتی دەژینو هەرچی کەیفو خۆشی ژیان هەیە لە شاخ و پێدەشتەکانا بەرپای دەکەن ، بێ گومانە کە ئەو کوردانە زۆر سادەو خاوێنو ئاگای گررژیو مۆنی نازانن •

**ئاین :**

کوردەکان زۆربەیان موسڵمانێکی لێبوردەی دڵ نەرمن بەڵام لە زمانی کوردیدا بە دەگمەن تووشی پەندو ووتەی پێشینان دەبێت کە پەیوەندی بە ئاینەوە هەبێت لە کاتێ کا باسیشی بکرێت تا ڕادەیەك بەزبریو گاڵتەوە باسی دەکەن :ـ

٦٤ـ سەرێ هلتە برینێ نایەتە کرینێ •
سەرێ کاتی برینی هات بەرتیل ڕزگاری ناکات « واتە قوربانیو خێر ـ وەرگێرەکان ـ •

٦٥ـ من دافینا نە مەلا چ ویتە ویتە •
من ڕازیو تو ڕازێ چی دەوێت مەلاو قازی ؟

٦٦ـ ژ سۆفیا نەکە باوەڕ ئەگەر شاشك ژ نورێ بت •
بڕوا مەکە بە سۆفیو مەلا بام مێزەرەکەیان لە ئاسمانەوە هاتبێت •
کە باس مەلاو فەقێ لە هەندێ ووتەی پێشینانێدا دەکرێت بە پارە

پەرستو چاو چنۆك ناو دەبرێن •

٦٧ـ بە مەلایەکیان ووت :ـ مەلا کەرەکەمان کەرەکەتانی کوشتووە•

مەلا :ـ کەر نە تۆڵەی کەرا •

ووتیان :ـ کەرەکەت کەرێکی تیمەی کوشتووە •

مەلا :ـ کەر بێ زمانەو هیچی لەسەر نیە •

**چیرۆکێکی تر لەم بارەیەوە :ـ**

جارێك مەلایەك کەوتە گۆمێکەوە ، یەکێك لە نزیکیەوە هاواری لێ کرد :ـ مەلا دەستم بدەرێ ، یەکێکی‌تر لە نزیکیەوە ووتی مەلا تەنها بدە دەزانێت‌و هاتێ نازانێت !!

**سامانو پارە :ـ**

هەڵوێستی کوردەکان لە بارەی سامانو پارەوە تا رادەیەك ئاڵۆزە ، لە لایەکەوە زۆر بەژیری‌و زیرەکانەو رێزەوە تەماشای کاسب‌و سامان دەکەن ، لەلایەکی تریشەوە بە سەرهات‌و چورتمی رۆژگار وەهای لێ کردوون ، کە سامان بە بەڵاو چڵکی دەست دابنێن‌و هەر کەسێك بکەوێتە داوی دەوڵەمەندی‌و پارەو پوول کۆکردنەوەوە ، لە رێگەی راست لائەداو ئاسوودەی دەروونی نامێنێت •

٦٨ـ رێ‌یا پینەدۆزە بەر دەرێ سولکەر شل دکەت •

مالێ پینەچی لەپێش مالێ قۆندەرە درووودا ئەرووخێت واتە مالێ سامان لە لای سەرمایە دارانە •

٦٩ـ مالێ دەوڵەمەند چەنا فقیری شل‌دەکەت •

سامانی دەوڵەمەند بەسە •

بۆ ئەوەی دەمو قورگی هەزاران شەکەت بکاو قوڕبدات بە دەمیاندا ، واتا هەزارەکان خۆیان ئەڕەتێنن‌و هەمیشە باسی پارەو پوولی سامانداره‌کان دەکەن •

٧٠ـ نەیارێ دا د جهالێ ئاری
هۆی هەموو ناکۆکی‌یەك جەواڵە ئاردەکەیە •
واتە مادەو پارە هۆی سەرەکی هەموو ناکۆکی یەکن •

**میوانداری :ـ**

وەك هەموو کۆمەڵگایەکی خێلەکی‌و شاخنشینی ، داب‌و نەریتی میوانداری دیاری کراوە ، پێویستیشە هەموو کەس بی زانێت‌و ئەنجامی بدات •

٧١ـ میڤان مێڤانێ خودێنە
میوان ، میوانی خوایە •

٧٢ـ ڕزقێ میڤان لە سەر خودێ‌یە
ڕزقیشی لە سەر خوایە •

واتە میوانێك کە دێت ، خوا بەشی خۆی لە گەڵ خۆی دەنێرێت •
لە لایەکی دیکەوە کوردەکان بە هەموو هەرزەی‌و زبری‌یانەوە کۆڵەوە ناکەن کە لە پەناوە میوانی ڕەزا تاڵ‌و تێسك قورس قاو بدەن :ـ

٧٣ـ پشتە پشتە بەلەکێ میڤان خۆشە ڕۆژەکی •
ختە ختە پشیلە بەڵەکە •
میوان هەر ڕۆژێ خۆشە •

٧٤ـ میڤان ژمیڤان ئاجزە خۆی ژ هەردووا ئاجزە •
میوان خۆشی لە میوان نەدەهات و خاوەن مانێش لە هەردوکیان •

٧٥ـ میڤانێ درنگە شەڤ لە سەرخۆیە •
میوانی درەنگ وەخت شێوی لەسەر خۆیەتی

« یاخۆ میوانی درەنگ وەخت کلەی لە شەر خۆیەتی » کوردەکان نەوەندە ڕاستو ڕووتەڤن « صریح » ، ئەوەندەش شەخسیەتیان بەکرداوی خەمتیان هەیە ، هەرگیز نایانەوێت ڕووبامایو مەرایی بکەن ، بەتایبەتی لە مەسەلەی گوساخیو میوانداریدا ، چونکە ئەوەی هەیانە درێژیو ڕژدی تیا ناکەن •

٧٦- خزمەتی بکە ژ پیرانڕە وەکی پیر دەبت خزمەتی بینی •

خزمەتی پیران بکە هەتا لە پیریدا خزمەت بکرێیتەوە •

٧٧- میوانداری قەرزەو ئەدرێ بە میوان •

٧٨- دیاری قەسپە شوان دیاری هەسپە •

دیاری دەنکێ خورما لەوانەیە ئەسپێکی لەدوا بێت • واتا گەردیلەیەکی بە کەڵک بەیت بە دیاری لەوانەیە ئەسپێکت بۆ بهێننەوە •

## دلسۆزیو ڕێزگرتن لە سەرەك خێڵو گەورەکانیان :-

لەبەر یاسای بەترباركی « باوكو[١٤٣] فەرزەندی » و خێڵەکێتی لە کوردستاندا ، کوردەکان زۆر بە دلسۆزیو ڕێزەوە پشتی سەرۆکو خێزانەکانیان دەگرن بە تایبەتی لە ناوچەی بۆتاندا •/

٨٠- بۆتێ بە مێریخوە شێرڤان ب شێریخوە هەکاری ب ڕاوتەگیرا خوە •

بۆتانی‌یەکان بە سەرۆکەکانیاندا ڕادە بەرموون وەك « شمشێر بە دەست ، بە شمشێرەکەیدا ، بەلام لە ناو هەکاری‌یەکاندا کێ بەکێ یەو هەر کەس بۆ خۆیەتی !

٨١- مەزنا بنە پرا داودتی مرۆڤ نادەت سەر •

کەسە رۆك خێڵو گەورەکان لـە ڕۆژی ڕەش‌و لێقەومانا بوون بە پرد خەڵکیش پێویستە بەسەر پردا بڕواو گیانبازی بکات •

٨٢- چەرمێ دەوار سەرباریێ کەرێ یە •

چەرمی حوشتر[١٤٤] لـە سەر پشتی کەرە • واتـا حوشتر هـەرچـەند زیندەوەرێکی پێشترو پلەی بەرزترە لـە کەر تەنانەت لـە کاتی مردنـی شـدا چەرمەکەی لـە سـەری خوار خۆیەتی •

هەندێ ووتەی پێشینانی کـوردی دەقـاو دەق « حرفیـا » وەك ئـەو پەندانە وەهان کە لـە ئەوروپادا زۆر بڵاون وەك :ـ

٨٣- نـە پڵنـگ دەشێت خالێن خوە بگۆڕێت و نـە عەبدێ ڕەشو •

نـە پڵنـگ ئەتوانێت پێستی شلی خۆی بگۆڕێ نـەبەندە قولـەکـان پێسـتیان •

٨٤- بەرێ خوە رست بروخ داگرتێ •

ئەو بەردەی خل ئەبێتەوە قەوزە ناگرێت •

٨٥- پشیلە نیـە لـەمـاڵو مشکان تـەراتێنیانە •

٨٦- مشکان ویستیان زەنگ بکەنەملی پشیلەکان •

٨٧- گوڵی سوور بێ درك نابێت •

٨٨- عەسایەکم دا لـە گەنمەکەیدا

[هەڵوێستی کوردەکان بەرامبەر هاوسێ‌کانیان] هەر چەند کوردەکان زۆر بە بێ ڕەحمانە هێرش کراوەتە سەریان‌و تالان کـراون ، بـەلام بـە درێژی سەدەکانی ڕابوردوو هەست‌و گیانی نەتەوایەتی خۆیان پاراستووە لـە هەمان کاتیشـــدا زۆر بـە سـووکی‌و بێ قـەدری تـەماشـای ئـەو داگیرکەرانەیان کردووە کـە ویستویانە پێ شێلیان بکەن •

٨٩ـ گەر دێ هەبویا مە پادشایەك لایق(١٤٥) بدیا خوەدە کولاهەك
ڕۆم و ... عەجەم تەمامێ هەمویا ژ مەرە دکر خولامێ .

گەربمان بوایە ئێمەیش پاشایەك بشیایە بۆمان تـەختو تاراجێك زۆر
بێ گومان کە رۆم و .... عەجەم لە خزمەت ئەوا بەندە بوون سەرجەم .

**هەڵوێستیان بەرامبەر تورکەکان :ـ**

کوردەکان بـە سووکیو ڕقەوە تەماشای تورکـەکانو کرداریـــان
دەکـــەن :ـ

٩٠ـ وەکی خەبەرا رۆمیان
وەك قسەی تورکەکان وەهایە هیچ بایەخێکی نیە .
٩١ـ خواکەس نەخاتە داوی تورکانەوە .
٩٢ـ گرانە وەك باجو بێگاری تورکان .
هەڵوێستیان بەرامبەر فارسەکان :ـ

وەك مرۆڤێکی ناپاکی فێلبازی بێ ڕوو بێ بـار تەماشای فارســەکان
دەکـــەن .

٩٣ـ وەکو شمشێری عەجەمە

واتە دوو سەریەو هەردووکیان تیژەو ئامادەیە بدات لـە دۆستیشو لـە
دوژمنیش !!

٩٤ـ وەکی عەسکەرێ عەجەمانە
وەك سەربازی عەجەم دەبەنگو کەودەنە .
٩٥ـ وەکو عەجەم زلو قەپۆلەیە .
٩٦ـ . . . . . .(١٤٦)

٩٧ـ . . . . . . .(١٤٧)

هەڵوێستیان بەرامبەر ئەرمەنی یەکان :ـ

هەستی کوردەکان بەرامبەر ئەرمەنی یەکان وەك هەستی خەڵکی ئەوروپای ڕۆژ هەڵات و ئەو پەری ڕۆژهەڵاتی شاری لندن وەهایە ٠

٩٨ـ نینۆك فەلەیە

وەك نینۆکی ئەرمەنی یەکان درێژە ٠

واتا ئەرمەنی یەکان پیسو پۆخڵ و بەڕپووتن ٠

٩٩ـ هەسێ کولا سەێ تۆلا مێری فەلا لێ مەبە ئەولا ٠

نە بڕوات بە « کستانی » دووڕەگ بێ نە بە ئەرمەنی ٠

**هەڵوێستیان بەرامبەر عارەبان :ـ**

کوردەکان بە چاوێکی تایبەتی تەماشای دراوسێ عەرەبەکانیان دەکەن، بەو چاوە تەماشایان دەکەن کە قورئان بەزمانی ئەوان نێرراوە و پێویستە ڕێزیان لێ بگیرێت، وەك برایەك و هاودینێك تەماشا دەکرێن ٠ هەست و سۆزێکی قووڵ و ڕیشەداریان هەیە بەرامبەریان و بە دراوسێ و هاوبەشی بەرژەوەندی ژیانیان دەزانن(١٤٨) ٠

**هەڵوێستیان بەرامبەر نەستوری یەکان ـ ئاسووری ـ :**

ئاسووری یەکان بەلای کوردەکانەوە کوردی ئانوپۆن، پەندو قسەی پێشینانەی کورد لەم بارەیەوە هەست و سۆزی پاك و خاوێنی کوردەکان دەنوێنێ بەرامبەر ئاسووری یەکان ٠

١٠٠ـ ناف بەینا مە و دا موویەکە ناف بەینا مە و فەلا چیایەکە ٠

لـه نێوان ئێمەو ئاسووری یەکانندا مووە یەکە ، بەلام لـە نێوان ئێمەو ئەرمەنی یەکاندا[150] جیایەکە •

١٠١ـ هێجەتا سەرگینان دچنە گوندێ مەخینان •
بە بیانووی پەیداکرنی هەندێ سووتەمەنی ئەچینە دێیەکی ئاسووری یەکان کچێکی جوانیش ئەبینین]ەلێرەدا ئەوەیش ئاشکرا دەبێت کەژن وژنخوازی بووەو هەیە لە نێوان موسڵمان و ئاسووری یەکاندا ، باوەکو ژن لە غەیرە دین هێنان بەلای ووشکە موسڵمانەکانەوە شتێکی باش نیە ، بەلام لەگەڵ ئاسووری یەکاندا کە لـە بنـەچەدا کوردن و تەنانەت لـە سیفاتی شەخسیو بنەچەی گشتیدا وەك یەکن ـ ژن لـە یەکخواستن و دڵداری کردن شتێکی زۆر ئاسایی یە •

[ چەند ئێینی یەك لـە بارەی چەن خێلێکی دیکەی کوردەوە ] •

١ ـ عەشرەتی کلیجلی :ـ

ئەم عەشرەتە (٤٢٠) ماڵێك دەبن لـە قەزای بازارجیك ، لـەوەرگاو هەوارگەی هاوینیان لـە ئاگری داغە •
ئاین :ـ موسڵمانی عەلەوی ن •

زمان :ـ بە تورکی و کوردی ئـەدوێن ، بەلام تـورکی لـە زمـانی زکماکی خۆیان باشتر دەزانن •
حسن ئاغای کوڕی باقی سەرۆکی ئەم عەشرەتەیە :

| ناوی دێ | ژمارەی ماڵەکان |
|---|---|
| جەتاڵ هویك | ٢٠ |
| کیرنسی | ٣٠ |

| | |
|---|---|
| تەیفیت | ٣٠ |
| وەحسن | ٣٥ |
| هەموو | ١١٥ |

**٢ ـ عەشرەتی پیکالان : ( چەقەڵان )**

ئەم عەشرەتە (٨) دێیەك دەبن لـە ناوچەی مەرعەش‌داو یـەك دێ لـە بـازارجیك‌داو چـەند ماڵێکیش لـە بهێسن‌دا ، کۆکشـی کوڕی مەلا رۆکی ئەم عەشرەتەیە •

**دێ‌کانی ئەم عەشرەتە :ـ**

ڕۆڵەکانی ئەم عەشرەتە لـە ناوچەی مـەرعـەش‌دا لـەم دێیـانـە دائەنیشن :ـ

١ـ چورکان ٢ـ نەسیران٣ ـ داقی‌پیر ٤ـ کەرامە ٥ ـ سەرکۆشان ٦ـ علی محمد رش ٧ـ مورکی ، دێ‌کەی قەزای بازارجیکیش ئەڤانە کە (٣٠) ماڵێك دەبێت •

**٣ ـ عەشرەتی یوڤـان :ـ**

ڕۆڵەکانی ئەم عـەشرەتە ٣٧٥ ماڵێـك دەبن‌و لـە ٧ دێیەکدا جێگیر بوون ، خانووەکانیان برن‌و باڵیان بەیەکەوە داوە ، لە نزیك تنجیرلی قەزای بازارجیك دائەنیشن ، چەند ماڵێکیشیان لە مالاتیا دائەنیشن ، ئە عەشرەتـە موسڵمانی شیعە مەزهەبن ، هەندێکیشیان سوننی‌ین ، لەهجەیان کرمانجی‌یە، سەرۆکی ئەم خێڵە حەمەد ئاوتی‌و مامیش ئاغایە •

| ژ | ناوی دێ | ژماردی ماله ئان |
|---|---|---|
| ١ | میمش | ٥٥ |
| ٢ | عەلی بەگ | ٣٠ |
| ٣ | حسن خوجه | ٣٠ |
| ٤ | توپالان | ٣٠ |
| ٥ | کورشکیان | ٣٠ |
| ٦ | ئەفدیل ئەر | ١٠٠ |
| ٧ | جوچایران | ١٠٠ |
| | کۆی هەمووی | ٣٧٥ |

**عەشرەتی هەوایدی :** Hawaidi

ئەم عەشرەتە ١٩٤٠ خێزانێك دەبن و لـە ٣٠ دێیەکدا جێگیر بوون لـە قەزای بیهسین ، ٦٥ خێزانێکیان کە لـە ١٦ دێیەکدا نیشتەجێن لـــە سەرەتای هاویندا ئەچن بۆ « کوزاخ داخ » ، زۆربـەی دێهاتـەکانی ئـەم عەشرەتە بـە باخ و بێستان گەمارۆ دراوون ، جوتیارەکانی بە شـێوەیەکی سـەرەکی گەنم بەرهەم دێنن •

موسڵمانن و سونی مەزهەب •

**زمـان :ـ**

ئەوسێ دێ گەورەیەی کە ٣٠٠ خێزانێك دەبن هەر بە تورکی ئەدوێن، بەڵام زۆربەی زۆری ئەم عەشـرەتە بە کـوردی ئەدوێن و هەندێکیشـــیان تورکی بـە باشی دەزانن •

**سەرۆکە ئەم عەشرەتە :**

«شێخ ئاغا زادە لەر»

گەورەی ئەم عەشرەتەیەو ئەمانەش سەرۆکەکانی ترن :ــ
رەشید ئاغا ، عەلی بەگ عەلی ئاغا •

[ چەند تێبینی‌یەك لـە بارەی عەشرەتی بالیانی کوردی‌وە ] •

**شتێك لـە بابەت مێژووی ئـەم عەشرەتەوە :ــ**

نەژداو بەچەی ئەم عەشرەتە لـە ناوچەی میشـــار Mishar ی نزیك ئاراغاناوە Arghanna دائەنیشتن‌و لە چەند دێیەکدا پرشو بلاو بوونەتەوە سێ کوڕی سەرۆکی ئەم عەشرەتە (٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش هەریەکەیان بوون بە گەورەی کۆمەڵێك‌و کوڕی گەورەیان لـە میشـــار مـایـەوە ، دوانەکەی دیکەشی باریان کردوو لـە ناوچەی مالاتیا جێگیـر بوون ، وەك دەڵێن دانیشتوانی دێکانی ناحیەی چوقاس
ئاخۆ اسپیندار لـە نەوەی یەکێ لەو برابانەی ، هەندێکیش لەم عەشـرەتە پەڕیونەتە ناوچەی سیواس و « وان » ، دێی بالیان دەکـەوێتە ناوچـەی « وان » •

ژمێرەك :

| ز | قەزا | ژمارەی دێ | ژمارەی ماڵەکان لە پێش جەنگدا | ژمارەی ماڵەکان لە دوای جەنگ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مالاتیا | ١٧ | ١١٤٥ | ٩٨٥ | ٧ دێیان لە ناوچەی شاخاویا دائەنیشن و ئەوانەشی کە دەشتەکین ٢٠٠ ماڵێکیان نەبێت لە هاوینا هەموو ڕەو ئەکەن و لە شاخەکانی دەورو پشتیان دەحەوێنەوە • |
| ٢ | تاکچی داغ | ٧ | ٦٨٥ | ١٤٥ | لە هاویندا بۆ هەوارگەی کوێستان ڕەو ناکەن و بەڵکو لە لقوپۆپی درەخت کەپر دروست ئەکەن • |
| ٣ | حوسنی منسوور | ٤ | ٥٠٠ | ٣٦٠ | هەموو دێکان جگە لە ١٠٠ دەوارێ نەبێت ـ ڕەو ئەکەن • |
| | | ٢٨ | ٢٣٣٠ | ١٤٩٠ | |

ئەم خێڵە لە مەیدانی جەنگ‌و نەبەردا زۆر کارامەو ئازان ، دەوڵەتی عوسمانی گەلێ جار هێرشی بردۆتە سەریان‌و بەنیازی تەمێ کردنی ئەو کەسانەی خۆیان لەخزمەتی سەربازی دزی بۆوە ، خانوو ماڵی ئەسووتاندن ، عەشرەتی باڵیانیش مەردانە بەڕوویانا دەتەقینەوەو کە نەفتیان دەکردن ، ئەو ملمـلان‌و راپەرینانەقاڵی کردبوون ، لەناو عەشرەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ـ کوردو غەیرە کورد شۆرەتو ناویان وەك ڕۆژ بەرزو دیارە ، لە هەموو کاتێکدا ئەتوانن (٤٠٠) تفەنگی تازە هەریەکەی بە ٣٠٠ فیشەکەوە بخەنە گەڕ،لە زستانی ڕابوردوودا گەنجێکی باڵیای کچێکی لەعەشرەتی ئاتەمی هەڵگرت ، ئەو ڕووداوە باری هەردوو عەشرەتەکەی ئاڵۆزان‌و دوژمنایەتی لە نێوان هەردوکیاندا دروست کرد عەشرەتی باڵیان دوژمنێکی بەسەر سەختی تورکەکانە .

**سەنگو پێوان :ـ**

کود :ـ پێوانەیەکە ١٢ کیلۆ گەنم‌و ١٠ کیلۆ جۆ ئەپێوێ .
لنگ دەکاتە پێ‌یەك
ئارین = ٢٧ ئینج

**دراووپارە :ـ**

لیرەیەك دەکاتە ٧ مجیدی
مجیدی‌یەك = ٢٠ قروش .
پارەی ماتەری « تاکەو قران » :ـ لەم کاتەدا بە کارنایەت .

**نرخی هەندێ شت :ـ**

گەنم :ـ
جۆ :ـ
کاوڕێکی یەکساڵان بە ١٢ مجیدیە =

دوو ساڵان بە ١٥ مجیدیە
گیسکی یەکساڵان بە ١٢ مجیدیە
دوو ساڵان « چیتر » بـە ١٥ مجیدیە

**بـاری کشتوکاڵ :ــ**

ئاسنێك لـە دەشتا ڕۆژی ٥٠ کود گەنم تۆو دەکات ، بەڵام لە لاپاڵو گردەکاندا ٢٠ ــ ٣٠ کود گەنمو ١٥ کود جۆو (٥) کود گاڵ دەکـات بـە تۆو ٠ لـە شوێنە بـەرزو لاپاڵەکانـدا گـەنمو گـەنمـەشامیو هێندێـك « گارس‌نابی » و تونتیش دەچێنن هیچ شوێنـە وارێکی مـەرەزە نیە لـەم ناوچەیەدا ، برشتو ڕێژەنی زەوی ١ بـە ٨ ــ ١٠ یە ، بـە تێکرا بەرهەمی دەشتەکان زۆرترە لـە گردو لاپـاڵەکان ، ناڕەزاییو بێ دادی زۆرم لـە جوتیارەکانی ئەم ناوچەیە بیستووە بـە تایبەتی لـە بارەی کەم تۆوی‌یەوە٠

**پاشـەرۆکانی جەنگ :ــ**

دانیشتوانی ناوچەکە لە ١٦٪ سەرجەمی گشت کەمی هێناوە ، ئاژەڵو ماڵاتیش لە ٥٠٪ ی کەمی کردووە ، باجو سەرانەی دەوڵەتیش کە سەپاون بـە سەر ڕۆڵەکانی ئەم عەشرەتەدا دەگەنە (٤١٠٠٠) لیرەی تورکی ٠

**یاسای مولکایەتی زەوی :ــ**

جوتیارەکانی ناوچەی ئاقچاداغ چواریـەکی بـەرهـەم ئـەدەن بـە خاوەن زەوی [ تەماشای ئەو سەرنجانە بکە کـە لـە بـارەی کـوردەکانی کورجیکەوە نوسراون ] ٠

ئـاویش ماڵی عەموانە ، خەڵکی هیچ باجو ڕەسمێك نادەن لە بری ئـاو ٠

ــ کوتـایی هـات ــ

**پەراوێزەکان :**

(١) بەختیاری ، یەکێکە لە خێڵە گەورەکانی کورد لە کوردستانی ئێراندا، هەندێ لە مێژوونووسەکان هەمیشە هەوڵی ئەویان داوە کە جیاوازی مەزهەبی ئەم خێڵە لەگەڵ زۆربەی خێڵەکانی تری کوردا بکەن بە ئاگرێکی دووبەرەکیو دوژمنایەتی بەو نیازەی کە ئەم خێڵە کوردە ڕەسەنە بخەنە خانەی خێڵە فارسی‌یەکانەوە .

(٢) لەهیندو کەنداوی عەرەبا ، وەك جێنشینی باڵوێزی عەرەبستان لە (ئەحواز)دا ئیشی دەکرد . لە گەڕانو تەی‌کردنی دەشتەکانی (کارون)و شاخە بەرزەکانی بەختیاری‌یشدا هەمان سوارچاكو لێهاتوو بوو ، لەم ئاقارەدا گەیشتە چلەپۆپەی چابوکیو ئازایەتی ، یەكدوو ساڵێ لەپێش شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا ، بۆ بەشداری کردنو بە دەس‌هێنانی «کاسی» کێ برکێ ـ ی وەرزش (کارپر) هەڵیان بژارد ، ئەم کێ برکێیە لەو کاتەدا لە جیهانی وەرزش‌دا بەرزترین ڕوودابوو « ڕاوەبەراز بە ڕم ، لە سەرپشتی ئەسپەوە » .

سێ . جی ئەدمۆنز .

(٣) بەڵام نۆیل خۆی دوورەپەرێز دەگرت کە ڕۆڵێکی دیاریو کاریگەری بێت لە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەدا «لۆرانس»یش هەمان دوورەپەرێزی بووە ـ وەرگێڕ ـ .

(٤) یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەی کە لەگەڵ نۆیل هاتوونەتە کوردستان .

(٥) بۆ ئەو ڕاپۆرتە نۆئیل کە لەسەردانی یەکەمی‌دا بۆ ناوچەی دیاربەکر نووسیویەتی کەوتینە پەیجۆرو پشکنینی لەگەڵ بەربلاو

« پەیمانگەی دراساتی رۆژهەلاتو ئەفریقاناسی »دا لە لەندەن بۆ هەمان مەبەست پەیوەندیمان کرد ، بەلام هەتا ئێستایش سوودێکمان نەکردووە ـ وەرگێرەران •

(٦) لە دووای داگیرکردنی ئینگلیزەکان لە سالی ١٩١٧دا ، کۆلۆنێل ئەرنۆلد ویلسن ، یەکەم جێگری حاکمی سیاسی بووە لە عێراقداو دانەری ئەم کتێبەیشە :ـ

Loyalities in Mesopotamio/BY A. T. Wilson.

(٧) ئیسلامەتیو خەلافەتنشینی :ـ لەپاشی داروخانی دەولەتی عوسمانیو دابەشکردنی مالو میراتی پیاوە نەخۆشەکە بەسەر فەرنسەو بریتانیادا ، بەلێ لەپاش ئاوابوونی ئەستیرەی خەلافەتی عوسمانی ، تورکەکان دەستیان دایە نێلە دانی هەستو سۆزی ئیسلامچێتی لەناو ئەو گەلو نەتەوانەدا کە بەدرێژیی (٦٠٠) سال بوو دەیان چەوساندنەوە مالو نیشتمانیان وێران دەکردن ، بەلێ لەپاش ٦٠٠ سال ستەمکاریو خوێن رشتنو چەوسانەوەی نەتەوایەتی دەیانویست کوردو عارەبو ئەلبانو چەرکەسییەکان هەنێز بدەنو بە بیانووی زیندووکردنەوەی کێشەیی خەلافەت نشینی بە سەرکردایەتی خۆیان ، بۆ ئەو مەبەستە چەند تاقمو کۆمەلێکیان نارد بۆ ئەو شوێنانەی کە لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم رزگار بووبوون ، ئەوە بوو ئۆزدمیر پاشا کە ئەفسەرێکی پایەبەرزی تورک بوو ناردیان بۆ ناوچەی ڕەواندز لە کوردستانی عێراق ، بەلام ئەم وەفدەو کۆمەلەکانی دیکەش هیچیان بۆنەکرا ـ وەرگێرەکان ـ •

(٨) شێخ عبدالقادر شەمزینی :ـ لە خێزانێکی تێکۆشەری کوردە یەکێکە لە دانەرانی « کۆمەلی بووژانەوەی کورد » کە یەکەم ڕێکخراوی سیاسیو نەتەوەیی کوردە لەم سەدەیەدا « کۆمەلێکی تر لە پیاوە بەناوبانگەکانی

کورد لـە دانانی ئەو کۆمەڵەدا بەشـداری‌یـان کردووە وەك ئـەمین عالی بەدرخـان ، جـەنراڵ شەریف پـاشـاو ... ، لـە سـاڵی ۱۹۲۳ دا شـێخ عبدالقادر کرا بـە ئەندامی « مجلسی مبوثـان » تورکیا ، لـەدوای تێشکانی شـۆڕشەکەی شێخ سعیدی پیران ـ ۱۹۲۵ ز ـ شێخ عبدالقادرو ســـید محمدی کوڕی دران لـە قـەنارەو چوونە ڕیزی ئەو شەهیدانەی کـە لـە پێـناوی ژیانێکی باشترو دواڕۆژێکی شەرفمەنداتە ترا بۆ نەتەوەکەیان ، لە پێـناوی ڕزگاربوون لـە دەسەلاتی چەپەڵی عوسمانی ، خوێنی خۆیـــان بەخشی [ تەماشای کتێبی ] « القضیه الکردیة : ماضی الکرد وحاضرهم ـ القاهرة ، عام /۱۹۳ ،لاپەڕ ۵۱۵ بکە .

(۹) دەسەلاتی ئەرمەنی‌یەکان :ـ ئەرمەنی‌یەکان وەك نەتەوەکانی دیکەی کوردو عارەبو ئەلبانو .. بە درێژەی ٦۰۰ ساڵ ، جارەها هەڵساون بـە شۆرشی چـەکداوانـە دژی دەوڵەتی عوســمانی ، زەقتـرین ڕاپـەڕینی ئەرمەنی‌یەکان لـە ساڵی ۱۸٦۲ز دابوو ، کە جووتیارەکانی ناوچەی زەیتون دژی زۆرو ستەمی عوسمانی‌یەکان هەڵسان بـە شۆڕش ، ئەم ڕاپەڕینە لـە ساڵەکانی ۱۸۷۸ـ۱۸۸٤ دا هەڵی‌دایەوە ، لـە ۱۸۱٦ یشدا ئەرمەنی‌یەکانی نـاوچـەی ( وان ) دژی کـاربـەدەستـانی تـورك ڕاپـەریـن . تورکـەکـان ڕاپـەڕینی ئـەرمەنیەکانیان دڵڕەقـانـە ســەرکـوت دەکـرد . ئـەم ڕەوشـتە گلاوەی عوســـمانی‌یـەکان بوو بـە هــۆی تووڕەیی‌و نارەزایی‌ئەوروپا ، بەو بیانووە گوایـا ئەمانیش فەلەن، بەڕادەیەك پەیمانی « سان ستیڤانو »ی نێوان ڕوسیای سەرکەوتوو وە دەوڵەتی عوسمانی ژێرکەوتووی بەزیو کە لە شوباتی ساڵی ۱۸۷۸ دا مۆرکراوە ، بەندی ۱٦ هەمی تەرخان کراوە بۆ مەسەلەی ئـەرمەنی‌یـەکان‌و خراوەتـە ئۆباڵـی دەوڵـەتی عوسمانی کە پێویستە بـاری ئیداری‌و ئابووری ئەرمەنی‌یـەکان باشتر بکات ، هەروەها لـە پەیمانی بەرلین‌یشدا کە لـە حوزەیرانی هەمـان

ساڵدا مۆرکرا ، ئەو مەرجەی دابین کردووە ، لە پەیمانی بەرلین‌دا دەوڵەتەکانی ئەوروپا « بەریتانیا « ڕوسیا ، ئەڵمانیا ، فەرەنسا ، نەمسا ، ئامادەبوون جگە لە دەوڵەتی عوسمانی‌و هەندێك لە گەلان‌و دەوڵەتانی بولقان ، سەرۆکی گشت کەنیسەکانی ئەرمەنیش چوو بۆ بەرلین ، بەو نیازەی لە کونفرانسی بەرلین‌دا بەشداری بکات ، بەڵام سەرپەرشت‌کەرانی کۆنگرەکە ڕێگەیان پێ‌نەدا کە بەشداری دانیشتنەکانیان بکات ، لەگەڵ ئەمانەیشدا بەندی (٦١) ەمینی پەیمانی بەرلین تەرخان‌کرا بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بانگ‌بکات بۆ باشکردنی باری ئیداری‌و ئابووری ئەرمەنی‌یەکان ، وە پێویستە ئەرمەنی‌یەکان ، لەنگەری ئیش‌و کاری ناوچەکەی خۆیان بگرنە دەست ، هەرچەند پەیمانی بەرلین هەتا ساڵی ١٩١٢ یش مایەوە بەڵام بەندی ٦١ هەمینی ئەرمەنی‌یەکان سەرەواوێکی لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە لێ نەخرایە ئیش ، دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا مەسەلەی ئەرمەنی‌یەکانیان کردبوو بە داردەستی خۆیان‌و بەو بیانووەوە دەمیان ژەندبووە دەوڵەتی عوسمانی‌و دەستیان دەخستە ئیشوکاری‌یەوە ، ئەویش نەك لەبەر خۆشەویستی ئەرمەنی‌یەکان بە ڵکو مرخیان لە موڵکەکانی پیاوە نەخۆشەکە خۆشکردبوو ، ئەو بارو دۆخە هانی ئەرمەنی‌یەکانی دا کە لە ڕووی سیاسەتی عوسمانی‌دا سەرپێچی بکەن، مەسەلەکە گەیشتە ڕادەیەك داوای جیابوونەوەو سەربەخۆیی بکەن ، بۆ گەیشتن بەو مەبەستەیان ، پەنایان بردە زۆر لاو پەیوەندیان بە زۆر شوێنەوە کرد ، لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم ئینگلیزەکان سەرلەنوێ لایەکی نریان کردەوە لە ئەرمەنی‌یەکان‌و کەوتنەوە ئێڵەدانیان بۆ دروست‌کردنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی کە دۆستی خۆیان بێت ، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە ئینگلیزەکان تەنها هەنگاوێکیان نەنا ، ئەرمەنی‌یەکانیش

بەبێ هەست کردن بە تۆمەتی دواڕۆژ دەستیان کورد بە هەڕەشەو گوڕەشە لە کوردو غەیرە کورد کە شمشێر دەخەنە سەر ملی هەموو موسڵمانێکی ئەو ناوچەیەی کە بە خەیاڵی خۆیان دەبووە دەوڵەتی دواڕۆژی ئەرمەنی ● دیارە ئەڵێ لە ناوچە کوردەکانیش ئەخرایە سەر ئەو دەوڵەتە ـ «بڕوانە کتێبی» د ● کمال مظهر «کوردستان لە ساڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا لاپەڕە ٢٤٧ ، ٢٤٨ ، ٢٤٩ » ●

(١٠) واتا ناوی مێجەر نۆئیل ـ وەرگێڕ ●

(١١) سەیرە !! ئینگلیزەکان داکۆکان ئەکەن لە بازرگانە موسلمانەکان بەهەرحاڵ ، بەڵام ئەوی جێگەی سەرنجە بازرگانی موسڵمانی کورد بە تەنها بەم دەردە برابوو یاخۆ موسڵمانەکانی تریش ـ وەرگێڕەکان ـ●

(١٢) مەبەست لە هێڵی ئاسنی بەرلین ـ بەغدای ناودارە ●

(١٣) هێزەکانی روسیا تیە ئەرمەنی یەکانی چەکدار کردبوو ، ئەوانیش کەوتبوونە پێش ئەو هێزانەوە کە لە ساڵی ١٩١٩ دا ناوچەکەیان داگیر کردبوو ، ئەو تیە ئەرمەنی یانە بێ ڕەحمانە هێرشیان دەبردە سەر کوردو غەیرە کورد ● قەسابخانەو وێرانەکاری یان لە هەموو شوێنێکدا بەرپاکرد ، ئەو هێزانە وەك حسن عەرەفە ئەڵێ لە دۆزەخەوە شالاویان هێنا : لە قەفقاس و تورکیا خۆیەوە ، وە پتر لە (٦٠٠) هەزار کوردی تیاکوژرا ، بۆ زانینی زۆرتر لەم مەسەلەیەوە بڕوانە :ـ

The Kurdis Hassan Ara Pa. London - 1965 Page 25.

ئەوەی شیاوی باسە حسن عرفە یەکێك بووە لە جەنراڵەکانی سوپای ئێرانی، وە خۆی لە ڕووداوەکانی مەهابادی خوێناوی دا ساڵی ١٩٤٦ـ١٩٤٧

زیاوه ، ئەو کاتـەی کە قازی محمد کۆماری مەهابادی دروست کـردوه حەسەن عرەفەیش دەوڕێکی نامرۆڤانەی بووە لەو ڕووداوانەدا •

(١٤) ئەمە ڕای نۆبلە وەك ئەفسەرێکی سیاسی ڕای حکومـەتەکەیەتی کـە خۆی ئەزانێ هەمیشە سیاسەتی دوو بـەرەکی هەڵئەبژێرێ‌و لە هەمان کاتیشـــدا ڕای شـەخـــی خـۆیش ووتـوە کـە ئاشـتەوایی باشـترە ـ وەرگێڕەکان •

(١٥) ئەم هەلبەستە لـە پاشکۆی کوردی عیراقدا ژمارە ٣٢/٢٥/ك[٢]/ ١٩٨٠دا بەناونیشانی [ سترانا دەرکوش ] •

(١٦) معطاء •

(١٧) بێ گومان ئەم لێکەیشتنە هـۆی « جارپاکی » ئینگلیـز نیـەو لـە خۆیشی‌یەوە دروست نەبووە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(١٨) ئەرمەنی‌یەکان نەخشەی خۆیان کێشـابوو ، گـەلێ لـە نـاوچە کوردەکانیش خرابوونە سـەر دەوڵەتە خەیاڵی‌یەکەی خۆیان ، هەرچەند ئـەو ویلایەتانەیش هیچ پێناسەیەکی مێژوویی‌و نەتەوەیی ئەرمەنی تیـــا بـەدی نەدەکران ـ وەرگێڕەکان ـ •

(١٩) هەرچەندە ئەرمەنی‌یەکان خوێنی کوردیان زۆر ڕشتووە بـاوکـو بـاپیرانیشمان کـەمیان پێ نەکردوون ، بەڵام لەگەڵ ترۆکەی نوئیل‌داین ـ وەرگێڕەکان •

(٢٠) قزڵباش یە تورکی مێژەر سوور ، ئـەو شـیعانـەی کـە شۆێنی شـا ئیسماعیلی صفوی کەوتوون ناونراون قزڵباش ـ وەرگێڕەکان •

(٢١) سوڵتان سلیم :ـ نۆهەمین سوڵتانی عوسمانی‌یە « ١٥١٢ـ١٥٢٠ » ،

« قنصوالفوری » کە پاشای ممالیکەکان بوو لە جەنگوە ... ـە نزیـك حەلـەبەوە سولـتـان سەلیم سەری پێ شـۆڕکرد ـ ١٥١٦ ـ ، هەرووەهـا سـوریاو میسریشی داگیرکرد •

(٢٢) شا ئیسماعیلی سەفەویی :ـ دامەزرێنەری بنەماڵەی سەفەوی‌یەکانە لـە ئیراندا ، وەك ئەلێن گوایا بـە بنەچـە دەچێتەوە سـەر ئیمام موسـای کاظم ، لـە کاتێکا ئێران لـە ئاڵۆزی‌و پشێوی‌دا ئەژیـا بە پاڵپشت خێڵـە تورکەکان ئیشوکـاری دەوڵـەتی خـستەژێر دەست‌خـۆی ، شـیروان‌و ئازەربەیجان‌و سەرووی عێراقـی داگیرکـرد لـە سـاڵی ١٥٠٢دا بـانگی پاشایی بۆ درا ، بەڵام لـە جەنگی «جالدیران»دا عوسمانی‌یەکان بەزاندیان‌و شەڕەکەی دۆڕان •

(٢٣) نازانم ئەو زمەرە چیە نوئیل کە دەی‌کاتە باسەکەوە ، لـە کاتێکـا خۆی لـە چـەند شـوێنێکی تری ئـەم ڕاپۆرتەی‌دا هـەموو گـومـانێـك دورئەخاتـەوە وەرگێڕەکان ـ •

(٢٤) هەمان نەریت لـە ئەوروپـای قۆنـاغی دەرەبـەگیـا زۆر بـاوبوە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٢٥) ـ مارك سایکـس :ـ یەکێکە لە پسپۆرە تایبەتی‌یەکانی ئینگلیز لـــە ئیشوکاری ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەراستا بـە گشتی لـە پێش جـەنگی جیهانی یەکەمدا لـە بارەی عەشایرەکانی نێـو دەوڵـەتی عوسـمانی ، وە بەتایبەتی عەشایەری کوردو عارەب زانیاریەکی فراوانی کۆکردۆتـەوە ، سـوریـاو ئـەردن‌و فـەلـەستین‌و زۆربەی ناوچـەکانی ئیمبراتۆریـەتی عوسـمانی گـەراوە ، دانـەری ئـەم کتێبـانـەشـە

---

١ ـ کتێبی دار الاسلام •

Dar Al - Islam, London 1904

2 — Caliphs last Heritage - Aslort history of the Turkish Empire, London. 1915 p.p. 553-588.

(٢٦) ـ ئەو قائمقامەعەرەبێکی موسلمانی لیبنانی بووە •

٢٧ ـ جاف :ـ عەشرەتێکی گەورەی کوردەو بگرە لە هەموویشیان زۆرتر پەلیو پۆی هاویشتوە بۆ ناوچەکانی کوردستان ، لە سەرەتاوە لە ناوچەی جوانرۆ ـ کوردستانی ئێران ـ دائەنیشتن ئەم سەرەتایە دەگەرێتەوە بۆ رۆژانی میرنشینی ئەردەلانی یەکان لە ساڵەکانی سەدەی ١٧ هەمی زاینی‌دا، بۆ زانینی زۆرتر لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبی: [العشائر الکردیة بین الزابین ـ لمؤلفە تی جی نار] وەرگێری لە ئینگلیزی‌یەوە بۆ عەرەبی فؤاد حمە خورشید ، لاپەڕە ٧٦-٨٧ •

(٢٨) بە داخەوە لەم ڕاپۆرتەدا نەی‌نووسیوە ـ وەرگێر •

٢٩ ژنی کورد لە هەموو ژنانی ڕۆژهەلاتدا بەوە جیا دەکرێتەوە کە چارشێوو پەچە ناپۆشێ‌و لە هەموو خوشکانی موسلمانی ئازادترە ، بۆ زانینی زۆرتر لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم کتێبانە :ـ

1- Kurdish Woman's Life by. Mrs. Hansen 1961.
2- The Daughters of Allah by. Mrs. Hansen 1957.

(٣٠) میللنجن :ـ ئەفسەرێکی ئینگلیزیە لە نیوەی سەدەی هەژدەهەمدا هاتۆتە ناوچەکانی کوردستانەوە ، وە کتێبی « ژیانێکی ساکار لەناو کوردەکانا »ی داناوە •

The wild life among the Kurds - London, 1870.

(٣١) روبارێکە لە خۆزستان ـ وەرگێر •

(٣٢) کشتوکاڵ لە ...... :ـ نوئیل خۆی گێل ئەکات یاخۆ هەر ئەوەندەیان تێکەیاندووە ، ئەگینا وولاتە پیشەسازی‌یەکان نەك لە سەرەتاوە ـ وەك خۆی ئەڵێ بەڵکو هەتا ئێستایش وولاتانی ڕۆژهەلاتیان بۆیە داگیر کردووە هەتا دەستەوخواری بەرهەمی پیشەسازی ئەوان بن‌و

سامانی کشتوکاڵی گەلانیش کێش بکەنە ووڵاتەکانی خۆیان ، تەنانەت لەم دۆخی جیهانی تازەیەشدا فایەڵ نین کە وڵاتانی ـ وەك ئەڵێن ـ « جیهـانی سێیەم » لـە هەموو ڕوویەکی پیشەسازی‌یەوە گەشە بکەن‌و هـەنگاو بنێن، لەوانەیە لـە هەندێ رووی پیشەسازی‌یەوە دەست بدەنە باڵی ئەو وڵاتانە بەڵام لـە ڕووە گرنگ‌و کرۆکدارەکانی‌یەوە چیلکە ئەخەنە ئیشیان .

(٣٣) ئـەوەی کـە لەمـەودوا دائـەنرێت بۆ فـەرمـانڕەوایی تورکیـا ـ وەرگێڕ ـ .

(٣٤) مالاتیا :ـ شارێکە تێکە لە لـە کوردو تورك‌و لـەسـەر ڕووبـاری فوارتـە ، دانیشتوانی ٢٥ هەزار کەسێك دەبن . بۆ زانینی زۆرتر لە بارەی ئـەم شـارە بـەنـاوبـانگەی کوردەوە بڕوانە کتێبی[ کورد لـە مێژووی دراوسێکانیا ] ـ سیاحەتنامەی ئەولیا چـەلەبی ـ مامۆستا سعید نـاکـام کردوویە بـە عەرەبی‌و کۆڕی زانیاری کورد لـە سـاڵی ١٩٧٩دا بڵاوی کردۆتـەوە ، لاپـەڕە « ١٠ـ٢٦ » .

(٣٥) واتە دیمەنێکی زۆر قەشەنگ ـ وەرگێڕ .

(٣٦) ـ تۆ بڵێی هۆی ئەوە بێت کـە تێریان خواردووە لـە کاربەدەستانی خۆیان‌و لاف‌و گـەزافی ئـەوان هیچ سـکێکی برسـی تێر نـەکـردووە ـ وەرگێرەکان ـ .

(٣٧) ـ گەلێ لە ڕۆژهەلاتناس‌و گەڕیدە بێگانەکان کە هاتوونەتە ناوچەکانی کوردستان ، بـە قووڵی‌و شێوەیـەکی کاریگـەر لـەسـەر میوانـداری کوردەکانیان نووسیوە ، بۆنموونە :ـ قازی ولیم دوگلاس لـە کتێبی «چەند وڵاتێکی نـەناسراوو چەند میللەتێکی پاك‌و خاوێن » دا باسی کردووە کـە میوانداری کوردەکان نـەك هەر خولـك گەومی‌یەتیـە بـە تەنها ، بەڵکو

پێویستە ئەو خوڵکەیش لە خوێنی کاوڕێ ، گوێرەکەیەك ، سووربکرێت ـ بروانــە ئـەو وتارەمان لـە بارەی ئەو کتێبەوە کە لـە لاپەڕەی ڕوشنبیری کوردی ـ ڕۆژنامەی عیراق لـە ۱۹۷۷/٦/۳۰ بڵاوکراوەتەوە •

(۳۸) ـ دەشوبهێتە یاسای ئینحسازی عیراقی کـە لـە کۆتـایـیەی سـاڵی ۱۹۷٥ دا هەڵوەشایەوە •

(۳۹) ـ ئەنوەر پاشا : ئەفسـەرێکی تورکە ، لـە ئەستـەمووڵ سـاڵی ۱۸۸۲ لـەدایك بووە ، یەکێکە لـە پێڕە سێتۆڵی‌یـە شۆڤێنی‌یـەکەی تورك ، کـە برێتین لە ئەمەو جەمال پاشای خوێنڕێژو تەلعەت پاشا، ئەم پێڕە لـە سـاڵی ۱۹۰۸ دا هەڵسان بـە کوردەتایەك دژی سوڵتان عبدالحمیدی دووەمم ، لـە قەفقاس‌و دەردەنیل‌دا ساڵانی ۱۹۱٤ـ۱۹۱۸ ئەنوەر پاشا ئیدارەی ســوپای عوسمانی بەدەست بووە • بۆ قەلاچۆکردنی ئەرمەنی‌یەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی ، لـە هەموو کەس بـە پەرۆشتر بوو ، ئەوەتـا • ڕەفعەت ‌ولان زادە • لـە یادداشتەکانیا ـ کە بەشێکی لەحەڵەب بڵاو کرانەوە ـ لـە لاپەڕە (۸۹ـ۹۳ دا) باسی ئەوە دەکات کە ئەنوەر پاشا بەبێ پەردە بانگەشەی داوە کـە پێویستە توخمی ئەرمەنی لـە دەوڵـەتی عوسمانی‌دا نەمێنێ‌و قـەلاچۆ بکرێت ، لـەو کاتەدا کـە لـە ناوچەی • تورکستانی سوڤێتی •دا ئاژاوەو سـەرێچی کردنی سەربازی بەرپـابوو بوو ، ئـەنوەر پـاشـایش خۆی هەڵقورتانە ئەو ئاژاوانە ، وە بە تێزەدانی ئینگلیزو ئەمریکا دەستی کــرد بـە هەڵنانی خەڵك دژ بە دەسەڵاتی بۆلشویکەکان ، بـەڵام لـە ئەنجام‌دا بە دەستی سوپای سوور لـە ساڵی ۱۹۲۲ دا کوژرا ، ئەنوەر پاشا بـە تەنهـا دوژمنی ئەرمەنی‌یەکان نەبوو ، بەڵکو لـە هەمان کاتیشدا ڕقی لـە کوردو عەرەبیش بووە •

(٤۰) ـ سوڵتان عبدالحمیدی دووهـەم :ـ ۱۸٤۲ـ۱۹۱۸ بـە زۆرداری‌و

خوێن ڕێژی ناوبانگی دەرکردبوو ، لە زەمانی ئەما بوو کە قەسابخانە بۆ ئەرمەنی‌یەکان دانرا ، قسەیەکیش بۆ دز بکەین ئەوەتا مێژوو باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییو ڕێکخراوە زایۆنیزمەکان بەرتیلێکی زۆریان خستە بەردەم سوڵتان عبدالحمید بەو نیازەی دان بنێت بە هەقی جولەکەکاندا لە نودس بەڵام بۆیان شل نەبوو .

(٤١) قارس :ـ ولایەتێکی بچووکی تورکی‌یە دانیشتوانی تێکەڵە لە کوردو تورکو ئەرمەنی .

(٤٢) ـ دەوڵەتی ئەرمەنی :ـ ئەو دەوڵەتە بوو کە بە پشتیوانی هاوپەیمانەکان ، لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم دروستکرا بەڵام زۆر کەمی خایاند .

(٤٣) ـ تکایە چاوێك بگێرەوە بە پەراوێزی ژمارە ٦ دا .

(٤٤) ـ کامران بدرخان :ـ کەڵە پیاوێکی سیاسیو ڕۆشنبیری کوردەو لە ساڵی ١٨٩٥ دا هاتۆتە جیهانو لە کانونی یەکەمی ١٩٧٨ دا کۆچی دوایی کردووە ، ئەم پیاوە هەڵکەوتووە لە بنەماڵەیەکی سەرسەختو تێکۆشەرە ، ئەم خێزانە تەروەنەی وڵاتانی ترنو بێبەشن لە ژیانی ووڵاتەکەی خۆیان ، بنەماڵەی تێکۆشەری بەدرخانی‌یەکان لە پێناوی مەسەلەی ڕەوای گەلی کوردا کەڵە پیاوو گەنجەکانیان ناردە پای قەنارەو ناریکی بەندیخانەکانی تورکیا ، زۆر بە سەرسەختو لە خۆبوردنەوە بوون بە شۆڕە سواری ئەم مەیدانە کامران بەدرخانو جەلادەت عالی برای لە ساڵانی ١٩٤١ـ١٩٤٤ دا لە دمشق گۆڤاری [ هاوار ] و (روناهی) یان دەرکرد ، وە لە ساڵی ١٩٤٣ دا لە بیروت ڕۆژنامەی « ڕۆژانوێ »ی‌یان دەرکرد کە بە زمانی کوردیو عەرەبی دەرئەچوو ، وە لە دووساڵی

١٩٤٣ تـا ١٩٤٥ ڕۆژنامەی [ستێر]ی دەرکردو لاپەڕەکانی تەرخان کرد بۆ هێرش بردنە سـەر بیرو باوەڕی نازیو ڕەگەزپەرستی •

لـە مەیدانی پەروەردەیشدا دوکتور کامـەران بـەدرخان لـە قوتابخانەی ڕۆژهەڵاتی سـەر بە دانشگای سوربون لـە فەرنسـە زمـانی کـوردی ئەووتەوە ، بـە هیمەتی ئەو بوو بەشێکی تایبەتی لـە دانشگای نـاوبراودا کرایەوە ، قورخ کرابۆ ئەدەبو زمانو مێژوو کەلەپووری نەتەوەی کورد، لـە کۆنگرە جیهانی‌یەکانی زمانو مێژوودا بەشداری‌یەکی کارای هەبووە، بـە باسو تۆیژینەوەی ڕەسەنو ڕیشەداری زمانو مێژوو کـەلـەپووری کوردەوە ئەو کونگرانەی سەرقاڵ کردووە • ماوەیەکی کەم بەر لە مردنی خۆی هەموو ماڵو دارایو سامانی کردە قەبەڵی ئەو کەسەی کـە لە پاش خۆی ڕێکخراوێکی ـ مۆسسە ـ ڕۆشنبیریو زانست بـۆ زانینی زۆرتـر لـەم بـارەیـەوە بڕوانە ئەو وتارەی کە لـە گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان»دا ژمـارە ٥٥/حزیران/١٩٧٩ دا بڵاو کراوەتەوە بەم ناونیشانە : « بۆنـەی کۆچی دوایـی زانای گـەورەی کـورد د • کامـەران بـەدرخان »ەوە ، خوالێخۆش‌بوو لـە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٠دا هاتۆتە عیراقو یەکێکیشی بووە لـە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە کوردەی کـە لەگەڵ نوتێلدا هاتوونەتـە بەرزایی‌یەکانی کوردستان ، لەپاش گەڕانەوەی بە ماوەیەك عوسمانی‌یەکان فەرمانی سێدارەیان دەرکرد بۆ خۆیو باوکیو سورەیاو جەلادەتی برای ، بـەڵام توانیان دەربازبن ، کامەرانو جـەلادەتی بـرای ڕوویـان کـردە ئەڵمانیاو هەر لەوێ کۆلیجی یاسانسی تەواو کردوو ، دکتۆرایشی لـە هەمان باسـدا هێنا بـە پلەیەکی بـەرز ، بـاوکیو سوریـاش لـە میسـر گیرسانەوە •

(٤٥) ـ یانەی کوردی :ـ هەندێ لـە ڕۆشنبیرانی کورد لـە سەرەتای ئەم

سـەدەیەوە لـە ئەستەموول هەڵسان بـە دامەزرانی ئەو یانەیـە ، وەکـو شێخ عبدالقادری شەمزینیو خێزانی بەدرخانی‌یەکـانو شەریف پـاشـاو هەندێکی‌تر ، بـەو نیازەی ڕۆڵـەی نەتەوەکەیان یەك بخەنو داوای مافی ڕەوای خۆیان بکەن .

(٤٦) ـ مەبەست لـە ڕۆژنامەی سـەربەستی‌یە کـە یانەی کـوردی بـە سـەرپەرشتی بەدرخانی‌یەکان لـە ئەستەموول دەری‌ئەکرد .

(٤٧) ـ ئورفا :ـ «رەها» یشی پێ‌دەوترێ ، شارێکی تێکەڵی کورددو تورکە لـە نیوان دیجلەو فراتدایە ، دانیشتوانی ٤٥ هەزار کەسێك دەبن ، لـە سەدەکانی سێ‌و پێنجی زاینی‌دا شۆڕەتی بەوە دەرکردبوو کـە پـایتەختی زانینی‌و ئەدەبو ڕۆشنبیری بووە ، لـە سـاڵی ٦٣٩زدا موسڵمانەکان دەستیان بەسەرا گرتووە ، لـە بەغدادیشدا نزیك بـە ساحەی تەحریر گەڕەکێك هەیە بـە ناوی « اورفەلیە » ، مووچەخۆرە گەورەکانی کورد لـە کـاتی عوسمانی‌دا لـە ئورفەوە بـە هۆی وەزیفە لـە بغداد جێگیـر دەبوون ، مێژووی ئەو گەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ١٥٠ ساڵێك ـ وەرگێڕەکان .

(٤٨) ـ مەبەست لـە کوشتاری ١٨٩٥و ئەو کوشتارانەی دوای ئەوە کـە دەزگای عوسمانی بـە ڕەسمی‌و غەیرە ڕەسمی ئاگریـان خۆش‌کـردووە ـ وەرگێڕ .

(٤٩) ـ کۆمەڵێکی تورکی تۆرانی بـاوەڕن بـە ناوبانگن لـەوەدا کـە بـە کوێرانە لـە هەموو شتێکی تورك داکۆکی ئەکەن ، کـە لـە پیاوانی ئەو جوڵانـەوەیـە سێ قۆڵـە شـۆڤێنیە ئەنوو پـاشـاو طلعەت پـاشـاو جمال پاشای خوێن‌ڕێژ بوو ، ئەمانە بوون کودەتایان لـە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم کردو دەستوریان لـە ساڵی ١٩٠٨دا بڵاو کردەوە لـە سـەرەتاوە داوایان ئەکرد کە سنوور دابنرێت بۆ کردەوەکانی سوڵتان عبدالحمید کـە

بـە خوێن ڕێژ ناوی دەرکردبوو ، وە کەلەڵانی ژێردەست عوسمانی مافی خۆیان وەربگرن ، بۆ ماوەیەکیش ئەو گەلانەیان چـەواشـەکرد ، بـەڵام هەرکە ئیش‌و کار کەوتە دەست سەروکلاوی خۆیـان پاشـگەز بوونـەوە لـە هەموو گفت‌و گەزافیان وە بـە ئاگرو ئاسن وەڵامی ئەو گەلانـەیـان دایـەوە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٥٠) ـ مەبەست لـەو کۆنگرەیە کـە موستەفا کەمال بـەستی لـەگـەڵ کۆمەڵە سەربازی‌یەکانی سەربەخۆی‌و پێی ڕاگەیاندن کە پێویستە دابنرێت بـۆ ئاڵۆزی وولاتەکەی کە خراوەتە ژێر ڕکێفی هاوپەیمانەکانەوە •

(٥١) ـ ئەوەی تێکۆشایە بۆ ڕزگاربوون لـە چنگی ئیسـتعماری تـورکی بـە خوفیەی ئینگلیزەکان ئەدرایە قەڵەم ـ وەرگێڕەکان •

(٥٢) ـ مەبەست لـە جوڵانەوەی نەتەوەی کوردە ـ وەرگێڕەکان ـ •

٥٣ ـ هەڵی‌ئەنێت بۆ گرتنی ئەو کوردانەی کـە لەگـەڵ مێجەر نوئێل‌دان ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٥٤) ـ ئەو بەدرخانی‌یانەی کـە لەگەڵ نوئێل هاتوون ـ وەرگێڕ ـ •

(٥٥) ـ کەمال ساڵی ١٨٨١ لـە سلانێك لەدایك بووە باوکی جوولەکەیەو دایکی یونانی‌یە ، چۆتە سوپاوەو پلەکانی سـەربازی بـڕی‌وە بـووە بـە سەرۆکی حزبی نیشتمانی تورکی‌و لـە ساڵی ١٩٢٣دا کرا بە سەرکۆماری تورکیا ، بە گشتی‌ی دوژمنی کوردو عەرەب‌و موسڵمانەکان بوو ، پیتەکانی عـەرەبی لابردو نوسینی کرد بە پیتی لاتینی •

دوژمنایەتیەکی سەختی ئەکرد لەگەڵ پیاوە ئاینی‌یـەکاندا لـەژێـر پـەردەی هاوچەرخی‌و تـازەکردنەوەو گەیشتنـی بـە شارسـتانی‌یـەتی ڕۆژئاوادا دەی‌ویست نەتەوەی تورك لـە پەیوەندی شارستانی عـەرەبی‌و

ئیسلامی دابنرێت ، لە ١٠/٩/١٩٣٨دا مردووە • [ بڕوانە گۆڤاری ـ التربیه الاسلامیه ـ کە لە شاری بەغدا دەردەچێ ژمارە (٨)ی ساڵی (١٩٧٦)ی زاینی •

(٥٦) ـ کۆنگرەی سیواس :ـ سیڤاس یشی پێ ئەو ترێ :ـ لەپاش تێشکانی لەشکری عوسمانیو داگیر کردنی ئەستەموولّ لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە، خەلیفەی عوسمانیو حکومەتەکەی بوون بە دەسکەلای هێزە داگیرکەرەکان ، ئالەم کاتەدا موستەفا کەمالی ئەفسەر کرا بە پشکنەری گشتی سوپای عوسمانی لە ئەنازۆل • ئەم وەزیفە تازەیە دەرفەتێکی لەباری ڕەخسان بۆ ئەم ئەفسەرە تورکە کە پەیوەندی بە سوپاو فەرماندەکانی یەوە بکات ، لە ڕاستیدا ئەو قوماندانەش لە دلەوە هەڵتەقرچان بۆ وولاتەکەیان کە بە دەست بێگانانەوە چەند کەساسیو داماو بوو ، لە ١٥/٥/١٩١٩دا گەیشتە ئەنازۆلو چاوی بە ئەفسەرە پایە بەرزەکان کەوتو دەروونی خۆی بۆ والا کردنەوە کە ئەیەوێت هەڵسێ بەجوڵانەوەیەکی شۆڕشگێریو وولاتی لە گرێژنە دەرچووی بخاتەوە سەرباری ڕاستە ، وە شکۆو سامی وولاتو کەرامەتی پێشیل کراوی بهێنێتەوە دۆخی جارانی • ئەفسەرەکانیش زۆر بە گەرمی پێشوازییان لەو بیرو باوەڕە کرد ، هەرکە لەم ئەفسەرانە دڵنیابوو ئیدی ڕۆیشت بۆ ئەرزەروم ، بۆ هەمان کار لەوێش لەگەڵ پایەبەرزانی فەرماندەی تورکدا پەیوەندی کرد وە لەگەڵ ئەوانیشدا گەیشتنە پیلانێکی تایبەتی بۆ خۆیان • کە حوکومەتی دەسکەلای هاوپەیمانەکان بەجرتو فرتی مصطفی کمالیان زانی گوێزایانەوە بۆ ئەستەموولّ • ئەمیش سەرپێچی لەو فەرمانە کردو نەڕۆیشت ، وە لە ئەرزەرومو سیواسیدا دووجار کۆنگرەی بەست گەلێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی « مبعووسانی » عوسمانی کە لە ئەستەموول

دائەنیشتن بەشداریان کردووە لەو کۆنگرانەدا ، وە هەموو بەشداراونی ئەو دوو کۆنگرەیە هاتنە سەر ئەورایە کە حکومەتێکی شەرعی نیەو دەسکەلای هێزە داگیرکەرەکانە ، پێویستە میللەت سەرپێچی لە هەموو فەرمانو قسەیەکی ئەو حکومەتە بکات ، بڕوانە یادداشتەکانی مامۆستا رەفیق حلمی ـ بەرگی یەکەم .

(٥٧) ـ عەشرەتێکی گەورەی کوردە لە تورکیا .

(٥٨) ـ مەبەست لە والی مالاتیایە ـ وەرگێڕ ـ .

(٥٩) ـ مەبەستی لە شیعەیە ، رافضە یاخۆ روافض یەکێکە لە ڕێبازەکانی «مەزهەبەکانی» ئیسلام کە ڕکێفی هەموو ئیمامەکانیان جگە لە ئیمامی عەلی لەپاش پێغەمبەر ڕەفز کردووە ، لە دواییدا لەسەر ئەو ڕەفزەیش ڕایان جێگیر نەبووە ، بوونەتەوە بە چەند پارچەیەکەوە .

(٦٠) ـ لەوانەیە هەتا کۆتایی سەدەی (١٩) نوزدە هەمیشە زمانی کوردی لای ئەوروپایی یەکان نەزانراو بوبێت ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە چەندەها لێکولینەوەی ڕۆژهەلاتناسی هەیە لە بابەت کوردەوە ، بەچەو ڕەگەزیان ، زمانیان ، وێژەیان ، کەلەپورو نەریتیان ، ئەوەتا ٢٠٠ دوصەد ساڵ لەمەوبەر زانای ئیتالی « ماوریزوکارزونی » هاتۆتە کوردستانی عیراقو لە ناوچەی « ئامێدی »دا ١٨ ساڵ ماوەتەوە ، کتێبێکی لە بارەی ڕێزمانی کوردی یەوە داناوە ، هەروەها فەرهەنگێکی کوردی ـ ئیتالی ـ داناوە کە پتر لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار ووشەی تیا کۆکردۆتەوە ، لەم ئاقارەدا گەلێ زانای دیکە هاتوونەتە کایەوەو کەلێنیان پڕکردۆتەوە ، لەوکەسانە ، زابا ، لیرکی رووسی میوللری نەمساوی ، س . مسیوتزی ئەمریکی .. گەلێکی تر ، بنواڕە ووتاری ـ ئەوەی لە بارەی زمانی کوردی یەوە نوسراوە ـ ڕۆژنامەی عێراق ٩٧٨/٧/٣٠ .

(٦١) واتا ئەوەندە دەسەڵاتو تێکەڵی‌یان نەبوو لەگەڵ کاربەدەستەکانی تورکدا هەتا ئەوانیش دێهات قووت بکەنەوەو بیخەنە سەر موڵکەکانی خۆیانو توماریشیان نەکەن بە ڕەسمی هەتا لە باجیش قوتار بن ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٦٢) مەبەست لەو کۆمەڵەیە کە بە سەرۆکایەتی نۆئیل هاتوونەتە ئەو ناوچەیەو دەیانەوێت بارو دۆخی ناوچەکە بزانن •

(٦٣) مەبەست لە سەردانی یەکەمی نوئێلە بۆ ئەوناوچەیە ـ وەرگێڕەکان•

(٦٤) ـ دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ـ وەرگێڕ •

(٦٥) ـ لە شێوازو داڕشتنی ئەو بروسکەیەوە بۆمان ڕوون‌دەبێتەوە کە مەسەلەکان ئاڵۆز دەکرێو بوختانو دەسهەڵبەسیش تێکەڵ دەکەن ، بۆ ئەوەی بیرو لێکدانەوەی خەڵکی چەواشە بکەن • ئەکرەم بەگی جمیل پاشازادەی دیاربەکری کە ئەمان بە چلێتو سووك ناوی دەبەن یەکێك بووە لە ڕۆشنبیرانی کورد ، لە بەشدارانی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ ، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی « خۆیی‌بوون » بوو خۆیو قەدری بەگی برای دەربەدەری دەستی شۆڤێنی‌یەکان بوون • خوێندنی باڵای لە ئەورووپا تەواو کردووە • ڕۆڵێکی کاریگەری بووە لە ڕێکخراوە نەتەوایەتی‌یەکانی کورداو دڵسۆزانە لە پێناوی ڕزگاری گەلەکەیا تێکۆشاوە ، ئەکرەم بەك چەند ساڵێك لەمەوبەر لە دیمەشق بەوپەڕی ڕێزەوە گیانی پاکی بەخاك سپارد •

(٦٦) حسین شریفی مکە ١٨٥٢–١٩٣٠ لە ساڵەکانی ١٩١٦–١٩٢٤دا بووە بە پاشای حیجاز • لە غەریبیو تەروەنەبوونا ساڵی ١٩٣٠ی مردووە ،

دوژمن بەخوێن تینووی عبدالعزیزی کوڕی سعود بوو [ دانەری خێزانی سعودیەی ئێستا ] چونکە عبدالعزیز لە شوێن ئەو بووە پاشا ـ وەرگێڕەکان •

(٦٧) ـ مەبەست ئینگلیزەکانە ـ وەرگێڕەکان •

٦٨ ـ مەبەستی لـە شێخ محمودی نەمرە کە گەورەیەکی نیشتمان پەرستی بەناوبانگی کورد بوو ، چەند جارێك لـە کوردستانی عیراقدا شـۆڕشـی بەرپـاکرد دژی ئینگلیزەکـان ، لـە تـەمـەنی ٧٥ سـاڵی‌دا لـە بـەغدا لە ١٩٥٦/١٠/٩دا گیانی سپارد ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٦٩) ـ بایزید :ـ شارێکە لـە تورکیا •

(٧٠) ـ مەبەستی لەو کۆنگرەیەیە کە مصطفی کمال گرتی لـە ئەرزەرووم ـ لەمەوبەر باسکراە ـ •

(٧١) ـ مەبەست لە شورشەکانی کوردە لـە سەرووی عیراقدا •

(٧٢) ـ خوێندەواری زرنگ‌و هوشیار بۆی دەرئەکەوێت کە چۆن نـاوی ئیسـلام‌و یەکێتی موسڵمانەکان دەکەن بـە پەردەو بیانوو بۆ ئـەوەی گەلە ژێردەستەکانیان کـە ٦٠٠ ساڵە ئەیانڕەتێنن‌و خوێنیان دەمژن هـەر ژێـر دەستەی ئەوان بن ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٧٣) ـ ئەمەش ئەوپەری چەواشەکردن‌و دەبەنگی‌یە کە عەرەب یا کورد ئەگەر لـەوان جیابێتەوە نـاتوانێت بژی‌و پێویستە هـەر لـە ژێر ڕکێفی عوسمانی‌دا بژین ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٧٤) ـ ( باش قەشەی ؟ ئەرمەنی‌یەکان لـە ئەمریکا بەشێکی ڕاگەیاندنی لە هەموو دەوڵەتە ڕۆژئاوایی‌یەکانا تەرخان کـردبوو بۆ خزمـەتی دەوڵەتی ئەرمەنی کـە لە هیچ لایەکەوە سیمایەکی دیار نەبوو ، وە ڕووداوەکان‌و

نوشت‌و بڕی ئەرمەنی‌یەکانی گەورە دەکـردو فووی تێدەکـردن ، بەو نیازەی سۆزو بەزەیی‌ی دەوڵەتەکان بەلای خۆیانا ڕابکێشن‌و بە شێوەیەکی کاریگەرتر یارمەتی‌یان بدەن •

(٧٥) ـ مەبەست لەو کوردانەیە کـە لەگەڵ مێجەر نوێل‌دا هـاتوون بـۆ کوردسـتان •

(٧٦) ـ واتـا پەیوەندیمان لەگەڵ بەریتانیا زۆر ئاڵۆز ناکەین •

(٧٧) ـ ئەموو ئەو هێزانەیش لە بێگانەکان دڵیان کرمێ‌یە ـ وەرگێڕەکان •

(٧٨) ـ هێزێکی نیزامیە پاراستن‌و ئاسایشی ناوخۆ لە ئەستۆی ئەوا بوو •

(٧٩) ـ ترس‌و سامەکەیش هۆی ئەوە بووە کە بارو دۆخی تورکیـا بـە گشتی‌و کوردستان بـەتایبەتی لـەو کاتەدا ئاڵۆزی‌و بشێوی تیابوو بەتایبەتی لەو ناوچانەدا •

(٨٠) ـ کیاختا ، کیختە ، کختە : کەوتۆتە سەر ڕوباری ـ کیختە سوو ـ کـە بەشێکە لـە بەشەکانی فورات • وە کەوتۆتە باشووری ڕۆژهـەڵاتی مالاتیاوە کە ٦٥ کم لەوێوە دوورە ، لـە سەدەکانی ناوەڕاستدا مەڵبەندێکی گرنگ‌و شۆرەتی بووە ، پردێکی تیدایە مێژووی ڕۆنانی دەگەڕێتەوە بـۆ ڕۆژانی سیبتموس سایدوسی ڕۆمانی (٢٠٠) زاین •

(٨١) ـ لـە دەقەکەدا هیچ نەنوسراوە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٨٢) ـ بەڕای من ووشەی (قۆرخ) بڕ بە بڕی «ئیحتکار» ـ وەرگێڕەکان •

(٨٣) ـ لـە ڕۆژێکی وا قاتەوگرانی‌دا ، واتـا شێخ خـەمـەکەش منداڵـە ئەرمەنی دەگرێتە خۆی‌و • لـە دەمی ماڵ‌و منداڵی باروو دەگرێتەوەو ئەیدا بـەو منداڵە !! ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٨٤) ـ وا دیارە مەبەستی لـە ئاقاری سیاسی‌یە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(٨٥) مەبەستی لەو چەپاوو تالأنە بەناوبانگەیە کە لە لیڤرپول لە ساڵی ١٩١٩دا ڕوویدا ، خەلکێکی زۆریشی تیا کوژراو قوڵایی دەروونی کۆمەڵگای بەریتانی هەژان ـ وەرگێڕەکان ـ .

(٨٦) ـ هەڵنانو تێزەدان گەلێك شێوەی بووە : پارەو پوول ، تێلەدانی ئاگری ڕەگەزیو ئاین ، هەڵنان لە هەمان کاتیشدا هەڕەشە ـ وەرگێڕەکان.

(٨٧) ـ ڕۆژنامە نووسێکی فەرەنسی یە :ـ بە بەرتیلو پارەی تورکەکان کتێبێکی داناو قەسابخانەی ئەرمەنی یەکانی بەدرۆ خستە ئۆباڵی کوردەکان ـ وەرگێڕەکان ـ .

(٨٨) ـ ئافرەتی کورد هەتا ڕادەیەك ئازادترە لە ئافرەتەکانی تری دراوسێی ، مێردەکەی لە ماڵیش نەبێت ، زۆر هەژاریش بێت کەچی بۆ پێشوازیو بەڕێ کردنی میوان زۆر ئازادە ، بەبێ عەباو چارشێو لەگەڵ براو پیاواندا ئەچن بۆ ئیشوکاری ناو دەشتو دەر ،

(٨٩) ـ عەشرەتێکی گەورەو بەهێزی کوردە لەسەر سنووری ئێرانو تورکیا نیشتەجێن ـ وەرگێڕەکان .

(٩٠) ـ ڕەشە دڕکی پێ ئەڵێنو جۆرە ڕووەکێکە لە گویژ ئەچێتو لەپاش کردنەوە بەرەکەی ڕەش نەبێتەوە ـ فەرهەنگی زانیاری ـ دانەری مامۆستا کمال جلال غریب ـ وەرگێڕەکان ـ .

(٩١) ـ واتا بە کڕیار لەگەڵ بازرگانەکاندا ئیشیان کردووە ـ وەرگێڕەکان.

(٩٢) ـ کاتی نوسینی یادداشتەکان لە ساڵی ١٩١٩دا بووە ـ وەرگێڕەکان .

(٩٣) ـ حیسیەکان یەکێکن لە کەلانی دێرینی ئاسیای بچووک ، «کوکمیتس» یاخۆ «تەرابلس» پایتەختیان بووە ، بەشێکی زۆری نـاوچـەی ئەنەدۆڵو ئاماوەیەکی زۆریش حەلەب خرابووە سەر وولاتەکەیان ، چەند کۆمەڵێکی زۆریشیان لـە زەمانی ئیبراهیم پێغـەمبەردا وە لـەنـاوچـەی «حبرون»ی فەلەستین‌دا نیشتەجێ بوون ، حەزرەتی ئیبراهیمیش یەکێکی لـە خۆیان کرد بە خەلیفەی خۆی کە ناوی (ممره) بوو .

لـە سەدەی سیازدەهەمی پێش زاینی‌دا حیسیەکان لەژێر فەرماندەی چەند پاشایەکی بەزاخو دەسەلاتدارا گەیشتنە پۆپەی شکۆو دەسەلاتداریی، بۆ دەستکرتن بەسەر ئاسیادا شانیان لـە شانی فیرعەونەکانی میسرو پاشاکانی ئاشوور ئەدا ، ئاشووری‌یەکان لـە سـەدەی ٩ هەمی پێش زاین‌دا سەریان پێ شۆڕکردن ، شوێنەواری زۆریان هەیەو زانایان لەم دواییەدا پەردەیان لـە ڕووی ئەو شوێنەوارانە لابرد ـ وەرگێرەکان .

(٩٤) ـ واتا بە فەرمانێکی ڕەسمی دەوڵەتی عوسـمانی وشـەکە گـۆڕاوە ـ وەرگێرەکان .

(٩٥) ـ بنوارە پەراوێزی ژمارە ٧ لـە بابەت ئیسـلامچیەتی گشتی‌یەوە ـ وەرگێرەکان ـ .

(٩٦) ـ لەو باوەڕەداین «کوود» ئەو ڕووتەیە کە ئێستەیش لـە ناوچەکانی گەرمیان‌دا بەکاردێت ، لادێکانی سەرەوەیش تەنەکەی بۆ بەکار دەهێنن ـ وەرگێرەکان ـ .

(٩٧) ـ بەمەزەنم ڕەطلێك باتمانەکەی لای خۆمانە ـ وەرگێرەکان ـ .

(٩٨) لـە تێبینی ژمـارە (٢)دا ئەبزار ئاغا برای حاجی شێخ ئاغـا بـوو ، بۆچی لێرەدا بوو بە ئامۆزا ؟ ـ وەرگێرەکان ـ .

(٩٩) ـ یۆوەرنکی کێشانەی ئینگلیزی‌یەو ١١٢ پاوەندە ـ وەرگێڕ ـ •

(١٠٠) ـ وابزانم خاڵە :ـ خەرووارەکەی لای خۆمانە کە ئەکاتە ٦ تەنکـە ـ وەرگێڕ ـ •

(١٠١) ـ تفەنگەکانی ئەو زەمانە لـەناو کوردستـاندا لـەپێش ١١ تیری ئینگلیزی‌دا ناویان ئـەمانە بووە : وەرەندل حسکە ، وەزر ، حەمـەتەقی ، مەعدەن ، لاکەل ، زێرساف ، چەتە ، ٣ تیر ، رووسی ، قرینبەیش لەوانەیە حسکەی لای خۆمان بێت کە تفەنگێکی کورتەو لـە کوردەواری خۆماندا فیشەکیان بـە تەرەقەی تفەنگی وەرەندڵ بۆ پڕ کردۆتەوە ـ وەرگێڕ •

(١٠٢) ـ بگرە دەشێ‌بێتە جۆی قاتمو گرانی ـ وەرگێڕ ـ •

(١٠٣) ـ لەلای خۆمان پێی ئەڵێن : چاوکەژال یاخو مەڕی چار •

(١٠٤) ـ لەکاتی نووسینی یادداشتەکانەوە ـ وەرگێڕ ـ •

(١٠٥) لەو بڕوایەدام لـە کوردستاندا زین‌دروو هەر پیاو بووە ، بـەڵام مەبەستی نوئێل لەسەر زینەکە ئافرەت ئـەی‌چنی دورنیـە ناوچـە هـەبێ ئافرەتیش لەبەو بـاری تایبەتی لـە دروست کـردنیا بـەشـدار بـوبن ـ وەرگێرەکان ـ •

(١٠٦) ـ لـە هەندێ ناوچە پێی ئەڵێن تالوو ـ وەرگێڕ ـ •

(١٠٧) ـ دەم‌ودووی ئەرمەنی‌یەکان بۆنی ئەوەی لێ‌دێت کـە زۆر ناوچەو زەوی دەخەنە سەر دەوڵەتە خەیاڵی‌یەکەی خـۆیان ، وەك :ـ خـەربوت ، دیاربەکر ، هەکاری و بازارجیك • بڕوانە نامەی دکتورای ئەس ئەمباریان یریڤان ساڵی ١٩٥٦ کە بـە درێژی ئەمانە باس دەکات ، هەرچـەند ئـەو ناوچانەیش لـەرووی مێژوو واقعەوە هی کوردن ، لـە لایەکی تریشـەوە

کاربەدەستە کوردەکان دەمیان زەندۆتە ناوچەکانی ئەرمەنی‌و لـە جەرگەی ناوچە ئەرمەنیەکاندا زەوی زۆرو بەربلاویان کردووە بـە مولکی خۆیان.

بنواره کتیبی :ـ « کوردستان لـە سـالانی جەنگی جیهانی یەکەم‌دا نووسینی دکتور کمال مظهر احمد لاپەرە (٢٤١٥) ـ وەرگێرەکان ـ .

(١٠٨) ـ عوسمانی‌یەکان بـە شێوەیەکی زۆر نالـەبـارو بێ ئـابـروانـە دەستیان ئەخستە سـەرژمێری‌یەکان‌و پۆخلەیان دەکردن،بەتایبەتی دەسکاری‌ی ژمارەی نەتەوە ناتورکەکانیان ئەکرد وەك عەرەب ، کورد ، ئەرمەن ، ... ئەوەتا مێجەر نوئێل‌یش کەیشتـۆتەگیانی‌و ئابرووپـان بـاشتر ئـەبـات ـ وەرگێر ـ .

(١٠٩) ـ بـە لەهجەی کرمانجی خواروو پێی ئەڵێن شیربایی‌و مـارەیی ـ وەرگێر ـ .

(١١٠) ـ واتا « أرمل » پیوەپیاو لەسەر کێشی بێوەژن ـ وەرگێر ـ

(١١١) ـ الاحتضار ، بەلام بەم شێوەیە بنوسرێت تەواوترە :ـ گیانکەنشت ـ وەرگێر ـ .

(١١٢) ـ ئەمە لـە هەندێ ناوچەی کوردستاندا پێی دەوترێت کۆتـەڵ‌و ئالایی ـ وەرگێر ـ .

(١١٣) خوالێخۆشبوو جەلادەت ئەمین عالی بەدرخان ڕوونکردنەوەیەکی بلاوکردەوە، تیایا دووبارەی کردەوە کە سوورە لەسەر ئەوەی خێزانەکەی هیچ بەلگەو قەوالەیەکیان نەبووەو نیە بۆ ئەو دەنگ‌و باسە ، بەلام ئەوەیشی وتووە کـە لەوانەیە بچنەوە سەر [ خالدی ] یەزیدی ـ وەرگێرەکان ـ

(١١٤) سولطانی ١١ یانزە هەمینی عوسمانی‌یەکانە ، مزگەوتی بەناوبانگی

لـە ئەدرنـە دروست کرد ـ وەرگێڕەکان •

(١١٥) بە بیری ئێمە هۆی ئەو داڕوخانو هەرەس هێنانە ، کە ئەشوبهێت بـە وەکو هەرەس هێنانی ئەمارەتی ئەحمدی کورو ••• بنەما ئاینی یـەکـە بووە لەکاتی زۆر ناسکدا خراوەتە گەڕ • بەرادەیـەك هـەرکـەس سـەر نەخەفێنێ بۆ خەلافەتی عوسمانیو •• تەلاقی دەکەوێو فڕی بەخێزانییەوە نامێنێ !! ـ وەرگێڕەکان ـ •

(١١٦) سولتانی ١٠ هەمی عوسمانییەکانەو لەهەموویشیان شۆڕەتی ترە ، خۆی سـەرکردەی ١٣ هێرشی کردووە ، ١٠ یان لـە ئەوروپادا ، ٣ یان لـە ئاسیا ، سنووری سولتان نشـینەکەی گـەورەتر کـردووە ، یـاسـاو شـەریعەتەکانی تۆمار کردووە ، هەر لە کاتی ئەمدا بوو ، وولات ئاوەدانو بووژاوەتر بووە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(١١٧) شارێکە کەوتۆتە ناوچەی « ما بین النهرین » و لەسەر ڕوبـاری جغجغە ، دانیشتوانی ١٥ هەزار کەسێك دەبن لـە کۆنـەوە بـە شـوێنی قوتابخانەو مەدرسە ئاینییەکان ناوبانگی دەرکردووە لە نزیك ئەم شارەداو نـە چلەکانی سـەدەی نۆزدەهەمدا • جەنگی تورکو ئیبراهیم پـاشـا قـەوماوە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(١١٨) ئیبراهیم پاشا ١٧٨٩ ـ ١٨٤٨ لـە « روملی » لەدایك بووە ، لـە قاهیرەش مردووە ، کوڕی محمد علی پاشای گەورەیە کە بەڕەگەز کوردە، سەرکەوتنە بەربلاوەکانی ئیبراهیم پاشا بوو بەهۆی سەرکەوتنی سـیاسی محمد علی پاشای باوکی ، لـە « صعید »ی مصـردا زاڵ بـوو بەسـەر مەمالیکەکانا ، لـە دورگەی عـەرەبیدا زاڵبوو بەسەر وەهابییەکانا ، لـە « مورە »یشدا زاڵبوو بەسەر یونانییەکانا ، لـە سـوریاو أناضولیشـدا •

(١١٩) دورگەیەكی یونانی‌یە لـە دەریای سپی ناوەڕاستا ، دانیشتوانی (٣٩٠) هەزار كەسێك ئەبن ، شارەكانی سەر ڕۆخی دەریـای ناوەڕاست بەناوبانگن وەكو شارەكانی « لوكاندی » ـ وەرگێڕەكان ـ •

(١٢٠) عوسمانی‌یەكان هەر كاتێك كەوتبنە مەترسی‌و كورسی‌یەكەیان لەق بووبێت ، توانویانە ئاگری ئیسلامەتی لەدڵی گەلانی ناتوركا بێڵەبدەن‌و پڕیان بكەن ، ئەو گیانی ئسلامەتیە زۆر بە پیسی‌و نامەردانە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەكارهێناوە ، ئەوەتـا دەسەڵاتی عوسمانی‌یەكان ، ئەمیری گەورەی بەدرخانی‌و ٢٠٠ پیاوی جەنگاوەری ئـاوارەو تـەروەنەی كرێت كردووە ، كەچی لەوێش بێڵەی داون‌و بەناوی غەزاو كوفرەوە لەخشتەی بردوون ، ئەیان‌دا بـە گژی شۆڕشگێڕە یونانی‌یەكانا كـە ئەوانیش وەك كوردەكان ژێردەستەو چەوساوە بوون‌و ئـازادی سـەربـەخۆی‌یـان داوا نەئەكرد ـ وەرگێڕەكان •

(١٢١) صـالحیە :ـ ئێستـە گـەڕەكێكـی كـوردنشـینی دیمەشـقە ـ وەرگێڕەكان ـ •

(١٢٢) سەركردەی كوردی بەناوبانگ [ صلاح‌الدین الایوبی ] لـە تكریت ساڵی ١١٣٨ز هاتۆتە دنیاوە لـە ساڵی ١١٩١زدا لـە دیمەشق لـە دونیـا دەرچووە ، دامەزرێنـەری دەوڵـەتی ئـەیوبی ـ یـەو لـە كاتی سەلیبی‌یەكاندا گەورەترین پاشای موسڵمانەكان بووە ، لە جەنگی «حطین»دا ساڵی ١١٨٧ز سەركەوت بەسەر سەلیبیەكاناو قودسـی سـەنـدەوە ، لـە گوشـاخی‌و نـەفس بـەرزی‌و ئـازایـەتی‌و بێ‌فیـزی‌دا شـۆرەتی بـووە ـ وەرگێڕەكان ـ •

(١٢٣) ـ ئەوانەی كە نوێل باسیان ئەكات هەموویان مردوون ، ئاخریان

دکتور کامەران بدرخان بوو کە لـە کانوونی یەکەمی ۱۹۷۸دا لـە دیـا دەرچو – وەرگێڕ – ٠

(۱۲٤) – شارێکە لـە تورکیایەو دانیشتوانی ۷۰ هەزار کەسێك دەبن ـــە نزیکی ئـەم شـارەدا بوو سالّی ۱۸۲۲ز ئیبراهیم پاشای کوڕی محمد علی پاشای گەورە ، سوپای عوسمانی یەکانی شکاند ، گەلێ شوێنەواری مێژووی تیا هەیە ٠

(۱۲٥) جەلادەت بەدرخان :ـ لە ۱۸۹۷/٤/۲٦دا لـە خێزانێکی دیاری‌و ساماندار لەدایك بووە ، بنەمایەکی سیاسی‌و ڕۆشنبیری‌و هەستێکی بـاڵاو ناسکی بووە ، ئەمین پاشا بەدرخانی باوکی بۆ تەواوکردنی خوێندن ناردی بۆ ئەستەموول‌و کۆلیجی یاسازانی لەوێ تەواوکردووە ، کـە موسـتەفـا کەماڵ جڵەوی کاری تورکیای کەوتە دەس‌و سام‌و جەبەرەی خۆی نواند، فەرمانی دەرکرد کە ئەمین پاشاو ۳ کوڕی لە سێدارە بدرێ ، بەڵام هـەر چواریان خۆیان دەرباز کرد ، لـە سـاڵی ۱۹۲٥دا کامەران‌و جـەلادەت‌و سوریا خۆیان گەیاندەوە شۆڕشەکەی شێخ سعیدی پیران لـە تورکیـاو دەستیان دایـەوە سـەرپەرشتی‌و ڕێکخستنی ئـەنـدامانی جوڵانـەوە نهێنی‌یەکەیان ، کە پشتی‌وانی‌یان لـە شێخی شۆڕشگێر دەکـرد ، بـەڵام کە شـۆڕشە کە نوشستی هێناو شێخیان لـە سێدارە دا ، جەلادەت‌یش لـە ۱۹۳۰/۸/۲٥دا پەنای بـردە بەر سـوریـاو لـەوێش مایەوە هـەتـا لـە ۱۹٥۱/۷/۱٥دا مردن یـەخەی گـرت گەلێ ڕۆژنـامـەی دەرکـردووە دیـاری‌ترینیان ڕۆژنـامەی «هاوار»و «ڕوناهی» یـە ، ئـەم کەڵـە پیـاوە ڕۆژنامەنووسێکی کارامەو شارەزایەکی باشـی زمـان‌و ئـەدەبی کوردی بووە، ئەڵمانی‌و فەرەنسی‌و ڕووسی‌و ئینگلیزی‌و تورکی‌و عەرەبی بەتەواوی زانیوە ، چەند ئەو سەرچاوانە ڕاست گۆن کە دەڵێن بەڕاسـتی جـەلادەت

بەدرخان سوارچاکێك بووە لــە مەیدانی قەڵەمو چەکیشدا !! « بۆ زانینی زۆرتر لەم بارەیەوە بڕوانە » دمرشد الصافی الکردی جەمال خەزنەدار بــەغـدا ١٩٧٣/ • لــە کۆتایی‌دا ئەمەیش دەهێنمەوە یــاد کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی یادداشتەکانی پێشکەش دەکا بــە گیانی پاکی ئەم قەڵەمدارو ســوارچاکی کوردەو ئــەڵێ :ــ [ دیاری‌یە بۆ گیانی پاکی کوردێك کە تامردن بۆ کورد ژیـا ، بۆ گیانی ئەمیری بــە ئامانج نەگەیشتوو « جەلادەت عالی بدرخان » ••

یەکێکی تر هەیە کە ئەندامێکی گاورای بنەماڵەی بــەدرخانی‌یەکانــە کەچی نوئێل باسی نەکردووە ، بەلام شاعیری بەرزی کورد حاجی قادری کۆیی باسی بەدرخانی‌یەکانا دەڵێ :ــ

بەدرخانیو لەسەر لاچی لەمەو پاش
لەهەرلاو دەتان هاڕن وەکو ئاش

وە ئەو هەرچەند ئاوزە ردی نەکردووە لــە سیاقی باسەکەوە گومانی تیــا نامێنێ کــە مەبەستی « یەزدان شێر »ە •

ئەمیرێك ماوە پاشایە گوتی :ــ کێ‌یە گوتم شێرە گوتی لێرە ؟ گوتم لێرە ! هەتــا تــاران‌و هیندوستان بەخۆی شێرە وەکو ناوی لەشەردا ••

بڕوانــە حاجی قادری کۆیی بەشی یەکەم بەغداد/١٩٧٣ مســعود محمد •

(١٢٦) ــ ڕۆژنامەیەکی نەتەوەی کوردە یــانــەی کــوردی ئــەستەمووڵ دەری ئــەکـات

(١٢٧) ــ بەلامەوە زۆر سەیرە کــە نوئیل لــە کامەران وەها گەیشتووە کە گوایــا کرمانجی نازانێت ، لــە کاتێکدا دەستێکی باڵای هــەیە لــە دنانی کتێب بــە کرمانجی •

(١٢٨) ـ کەماڵی یەکان و تاقمەکانی ئیتحادو تەرەقی کە لە لادێکانی کوردو تورکا ئەسووڕانەوە :ـ ئەیان هێشت توتێڵ و هاوڕێکانی بکەنە ئەنجامێکی ووردی سەر زمێری ئەرمەنی یەکان و خێڵە کوردەکان ، سەیرا بەسەر توتێڵ و هاوڕێکانیدا کە بە پەلە بگەڕێنەوە بۆ حەلەب ـ وەرگێڕ ـ •

(١٢٩) ـ کونگرەی ئاشتی ـ یاخو کونگرەی سولح :ـ ئەم کونگرەیە لە پاریس سازکرا بارو دۆخی جیهان و ئەنجام و باشەرۆکانی جەنگی خستە ژێر لێکۆڵینەوە ، یاخۆ بەشی کردنی وولاتە بچووکەکانی ڕۆژهەلاتی ڕەچاو کرد •

(١٣٠) ـ بەشی بەحاڵی خۆم پڕ بەپڕ لەو پەرەگرافە ناکەم بەلام بە بۆچوونی من و ئەوەی لە یاسەکانی تری دوایی دا دەرئەکەوێت ، مەبەستی لە دچینە کۆمەلایەتی یەکانی ، ئەو عەشرەتانەن کە لە دێکانا جێگیر بوون، هەموو یاخۆ زۆربەیان لەیەك هۆزن ـ وەرگێڕ ـ •

(١٣١) ـ لەچی کەمتر نیە لە واقع یاخۆ لە تومارە دەولەتی یەکان ـ وەرگێر •

(١٣٢) ـ مەبەستی لە وەزارەتی جەنگی بەریتانی یە ـ وەرگێر •

(١٣٣) ئاشکرایە لە ڕۆژمێری ڕووسی ـ ئەرسەزوسکی کاری کردۆتە سەر کوردی تورکیا ، لە ڕۆژگاری چارەکانداو تا سەرکەوتنی شۆرشی ئوکتۆبەربش لە رووسیا رۆژمێری ناوبراو بەکاردەهێنرا ـ وەرگێڕ ـ •

(١٣٤) ـ تەباخ :ـ دەبێ لە تەپاکەوە هاتبێ ، کە مانای توتنەو لەو مانگەشدا توتن پێدەگات ـ وەرگێڕ ـ •

(١٣٥) نازانم مایسی لـە کوێوەهێنا بۆ قوتی کردەوە هەروەها بـەشی (٩)یش مایسیی تێدا هەڵتوقاندووە ـ وەرگێڕ ـ •

(١٣٦) باری ڕوشنبیری کورد بـە گشت.وویژەی بـە تـایبـەتی وەك گـەلانی تری ژێردەستـەی عوسـمانی بـە درێـژەی ( ٦٠٠ ) سـال فـەرمانڕەوایی یان تووشی لاوازیو ئیفلیجی بوبـوون ، لـە هـەمـووی بێئابڕووانەتر ئـەوەبوو کـە لـە ساڵـەکانی دوایـیدا دەسـتیان دایـە ڕەگەزپەرستیو بخەنك کردن بـە تورك ، بەڵام بـاری ژیان گۆڕاو لـە سەرەتای ئەم سەدەیەوە کوردی بوو بـە زمـانی ڕەسـمی لـە هـەمـوو نـاوچەکانی کوردستانداو لـە قوتابخانەکانا بـە کوردی ئەخوێنرا •

بۆ زانین زۆرتر تەماشای ئەو وتارەمـان بکەن کـە لـەسـەر کتێبی « خوێندنەوەی کوردی » ، دانـەری جمال جـلال ، لـە ١٩٧٩/١/٤دا نوسراوە ـ وەرگێڕ ـ •

(١٣٧) ـ لـە بـارەی خۆشەویستیو شـەیدایی کوردەکان بـۆ ئـازادیو سـەربـەستیی یەو باسـیل نیکیتین لـە لاپەڕە ٦٨ی کتێبی الاکـراد [دار الروائع دەری کردووە ] ڕۆژهەلاتناسی فەرەنسی بەناوبانگ لویس ماسینۆن پێشەکی بۆنوسیوە ] •

دەڵـێ :ـ کوردەکان جگە لە سروشتی توندو تیژیان ، پاڵەوانانەیش پارێزگاری لـە ناموسو شەرەفیان دەکەنو شەیدای ژیانی سـەربەستین جارێك سەرۆکێکی کورد لـە هێرشێکی حافظ پاشادا ، ساڵی ١٨٣٧ بە دیل ئەگیرێو دوژمنە تورکەکان گفتو بەڵێنێکی منەی بۆ هەڵئەڕێژن ، بـەو نیازەی ڕێو شوێنی سەنگەری شۆڕشگێڕە کوردەکانیان پێبلێت ، بـەلام

ئەویش مەردانە وەڵامی ئەو بەرتیلانەی ئەدایەوە :ـ سەرۆکی کورد هەرگیزاو هەرگیز نابێتە چاوساغو تانجی بێگانەکان ، دوو ڕۆژیش خرایە ژێر ئازارو ئەشکەنجە ، ئەوەیش ئاگری ڕقو کینەی پاشای دانەمرکاند هەتا مەنجەڵێك ڕۆنی قرچانو خستیە ناوی‌یەوە ، بەو شێوەیە دانی بەخۆیا گرتو ئەو مردنە پڕ شکۆیەی بۆخۆی هەلبژارد ـ وەرگێڕەکان •

(١٣٨) ـ بەڵام کوڕو وەچەی دوژمنی باوك بۆ نابێتە دۆست لەگەڵ وەچەی باوکدا !! بۆچی دڕکەزیی تۆڵەو دڵپیس بە خوێنی وەچەکانی داهاتوو ئاو بدرێت ، گەلێ جاریش لەلایەن بێگانەکان یاخۆ ئاغاو ستەمکارەکانی خۆمانەوە گیانی تۆڵەسەندن بە ئاوەزووی خراوەتە کار ، ئەوەیش لەیاد ناکەین کە هەندێ جار دوژمنانی گەل بۆ گێرەشێوێنیو ئازاوەنانەوە لایەك لە خێزانێ ، یا لە عەشرەتێ ، یا لە نەتەوەیەك ئەگرنو هانی ئەدەن دژی لاکەی تر ، لەم کاتانەدا ئەم پەندە ئەبێژرێ ، ئەمەش لایەکی تاریکی ئەم پەندەیە ـ وەرگێڕەکان ـ •

(١٣٩) ئا لێرەیشدا ڕوون ئەبێتەوە کە کوردەکان گەلێك تینووی ئاشتیو دۆستایەتین ، حەزیان کردووە دۆستیان زۆرتر بێت ، لەلایەکی تریشەوە بە چەکی دەستی خۆیانو بە دیوە پیسەکەیا خستوویانەتە ئیش :ـ
کردووە بە چەکی دەستی خۆیانو بە دیوە پیسەکەیا خستوویانەتە ئیش :ـ
مرۆڤ پیویستە ڕێگە نەداتو کارێکی وەها نەکات کەس ببێتە دوژمنی چونکە مرۆڤی دوژمندار ناوی بنێن مردوو !! ـ وەرگێڕ ـ •

(١٤٠) ـ بە پێچەوانەی دانەری کتێبی ( ڕابەری گەڕیدە بیگانەکان لە عێراق ) ، مولتکی ڕۆژهەلاتناس کە دەڵێن :ـ مرۆڤی کورد ڕووخۆشو خۆشمەشرەبەو بەلایەوە میوانداری زۆر بەڕێزو گرنگە ، هەرکەسێك پەنای بۆبهێنێ خاوەن پەنا ( سایە ) زۆر بەشەرەفەوە دەیپارێزێو

داکۆکی لەسەر دەکات ، بۆ زۆرتر زانینی لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبی باسیل نیکیتین لاپەڕە (٦٦) .

(١٤١) ـ دیارە مەبەستی لەوەیە کە کوردەکانی تورکیا ، نیشتمانی گشتیی کە تورکیاو دەوڵەتی عوسمانی‌یە ، بەبێ بایەخ تەماشای دەکەن ـ وەرگێڕ ـ .

(١٤٢) ـ یاخۆ میوانی درەنگ‌وەخت گلەیی لەسەر خۆیەتی ـ وەرگێڕ ـ .

(١٤٣) ـ یاسای بەتریارکی :ـ مەبەستی لە یاسای کۆمەڵایەتی باوکو فەرزەندی‌یە ، واتە باوك یاخۆ سەرخێلێك یا گەورەی کۆمەڵێك ، باوك‌ئاسا دەسەلاتێکی پڕەهای ڕێزلێگیراوی بێت بەسەر عەشرەت یاخۆ کۆمەڵەکەیدا .

(٤٤) ـ نازانم ووشەی حوشتر لە کوێوە هێنراو‌قووت کرایەوە هەرگیز کورد ئەو جیاوازی‌یەی بە «هەتاسەر»و نەمری نەداوەتە قەڵەم ئەوەتا ئەڵێ: مرۆڤ گا نیە هەر لە پێستێکدا بێت ـ وەرگێڕ .

(١٤٥) ـ ئەم چەند دێرە هی شاعیری بەناوبانگی کورد ئەحمەدی خانی‌یە « ١٦٥٠–١٧٠٧ » لە نزیك بایەزیدەوە لەدایك بووە ، لە بایزیدیش نێژراوە ، هەتا ئێستاش خەڵکی دێنە سەرگۆڕی‌و زیارەتی دەکەن ، « مەم‌و زین‌ی » داناوە کە یەکێکە لە شاکارو داستانە شیعری‌یەکان نەك هەر لە ئەدەبی کوردی‌یا بەڵکو لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتیشا بە گشتی‌ی ، بۆ زانینی زۆرتر لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبی :ـ [ ئەحمدی خانی شاعرا ومفکرا ، فیلسوفا ومتصوفا ] للدکتور عزالدین مصطفی رسول بغداد/١٩٧٩/ .

(١٤٦) ـ ئەم پارچەیەم وەرنەگێڕا چونکە لەم کاتەدا شایستەو ڕووی

ساوەدانی تیە •

(١٤٧) ـ هەروەها ئەم پارچەیەش •

١٤٨ ـ ئەم پارچەیەش ، هەڵوێستیان بەرامبەر عەرەبەکان ، وەرگێڕ تێچینی کردووە •

(١٤٩) ـ نەستۆری :ـ هەڵگری مەزهەبی «نەستۆریوس»ە کە هەرتەقەیش پێ‌دەوترێ‌و لە ساڵی ٤٣١زدا ژیاو ، بە بیرو باوەڕی ئەم سروشتی یەزدانی‌و ئینسانی لە عیسا پێغەمبەرا خوای لێ رازی بێ لە یەکتر جیابوون‌و هەر بە جیایش ماونەتەوە ، ئاسووری‌یەکان لەسەر ئەم مەزهەبەن •

(١٥٠) ـ ئەگەر مەسەلەکە ئاین بوایە خۆ هەردوکیان فەلەن‌و موسڵمان نین ـ وەرگێڕ ـ •

---

# سوپاس

بۆ

١ـ کاک حاجی ئەورەحیمە رزەی هەڵەبجەکە یارمەتی یەکی ئەوتۆی داین بۆ بە چاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە مێژوییە ..

٢ـ سەبری بۆتانی شاعیر ... کە دەقی یەندە پێشینەکانی پارچەی وان و بەرزاییەکانی دیجلەی بۆ ساغکردینەوە ..

وەرگێڕان

حسین احمد جاف

حسین نێرگسەجاڕی

رقم الايداع ١٦٣٧ في المكتبة الوطنية ببغداد لسنة ١٩٨٤

مطبعة أوفسيت حسام
بغداد ـ شارع المتنبي
هـ ٤١٦٢٩٩٤